ناوی کتێب: میوان ( چیرۆک )
نووسەر: ئەلبیر کامۆ
وەرگێڕ: حەمە کەریم عارف
تایپ: رزگار حەساری
هەڵەچن: زنار محەمەد
چاپی یەکەم ٢٠٠٩ سلێمانی
چاپخانە: سایە
ژمارەی سپاردن: ١٤٧٠

# وتەیەك

## هیچ وەرگێڕانێك ناكاتە ئەسڵی دەق

### حەمە كەریم عارف

((١))

وەرگێڕان، كارێكی یەجگار قورسە، گەر بوترێ كاری وەرگێڕان بە مانای دروست و تەواوی وشەی وەرگێڕان، كردەنی نیە، هیچ نابێتە زێدەرۆیی. چونكە ئەگەر وەرگێڕان مەحاڵ نەبێ، ئەوا بێگومان نیمچە مەحاڵە.. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا كارێكە تیرەی بەشەر ناتوانێ دەسبەرداری ببێ.. چونكە هیچ میللەتێكی سەر رووی زەمین بەتەنێ ناتوانێ هەموو كایەكانی ژیان و پێداویستییە فەلسەفی و هونەری و هزری و زانستی و ڕۆشنبیرییەكانی خۆی بەرهەم بێنێ. بۆیە ناچارە لە ڕێگەی وەرگێڕانەوە ڕێگەكان قەدبڕ بكات و بۆشاییە ژیاری و شارستانییەكانی پڕبكاتەوە. بۆیە زیادبوونی ڕێژەی وەرگێڕان، بە تایبەتی گەر بە شێوەیەكی بەرنامەدار بێ، كارێكی زۆر پەسندەو نیشانەی كرانەوەیە لە بەردەم زانست و زانیاری وهزرو هونەرو فەلسەفەی فەرەنگی و هێنانی بۆ ناو زوانی كوردی كە پێموایە ئەم پرۆسەیە یەكێكە لەو فاكتەرانەی كە زوانەكەمان لە نەزۆكی قوتار دەكات وبە ڕادەیەك دەیپیتێنێ كە ببێ بە زوانی بەخشش، لە هەموو ئاستە هونەری وهزری و فەلسەفی و زانستییەكانداو بەشداری جددی لە بەرهەمهێنای مێژووی تیرەی بەشەردا بكات، بە هیچ جۆرێ بەوە قایل نەبێ لە پەراوێزدا بمێنێ. كەواتە وەرگێڕان تا ئەو ڕۆژەی تیرەی بەشەر بە زوانانی جیاواز خۆ بگێڕنەوەو ژیان و ژیار وشارستانییەت بەرهەمبێنن، هەر دەمێنێ و قۆناغ بە قۆناغیش بە گوێرەی گۆڕانی پێداویستییەكانی مرۆڤ گۆڕانی بەسەردا دێت. واتە ئەوەی جێگەی گەنگەشەو موناقشەیە چۆنیەتی و چەندیەتی و شێوەی گوزارشت و دەربڕینی پرۆسەی وەرگێڕانە، نەك خودی وەرگێڕان..

((٢))

ئەوەی كە مایەی سەرنجە، هەندێ جار كەسانێك كە ڕقی شەخسی هەڵیان دەگرێت وخۆیان پێ جڵەو ناكرێ، دێن بە بێ ئینسافی لەو بەرهەمە وەرگێڕدراوانە دەدەن كە پڕ خوێنەرن، كە فرەخوێنەری خۆی لە خۆیدا نیشانەیەكە وشتی لەسەر ڕۆدەنرێ. مەبەستی لێدانەكە هەرچییەك بێ، بیانووەكە گوایە نائەمینی و جەڵەبییەتی وەرگێڕانەكەیە.. بەهەرحاڵ من قەناعەتی تەواوم بەوەیە كە هیچ شتێك لە سەرووی ڕەخنەوە نییە، بە خودی ڕەخنەشەوە.بەلاّم مەسەلەی دورستی ووردی و ئەمانەتداری لە كاری وەرگێڕاندا، نابێ بە شێوەیەكی میكانیكی وشك مامەڵەی لە تەكدا بكرێت و وەرگێڕ ناچار بكرێت، بە تەواوەتی تەسلیمی بونیادو ڕستەبەندی زوانی یەكەم، واتە ئەو زوانەی لێوەی وەردەگێڕدرێت، ببێ و بخرێتە ناو مینجاڕی وەرگێڕانی وشە بە وشەی بێ خوێنەر..چونكە هەر نووسینێك گوتارو پەیامی خۆی هەیە، وخەڵكانێك دەدۆێنێ.جا لێرەدا مەسەلەی گوتار دێتە ئاراوە. هەر دەقێك گوتاری خۆی هەیە.گوتار سەروكاری دەگەڵ یەكەیەكی

هونەری گەورەتر لە یەکەی ڕستە هەیە. وەکو چۆن بە کۆمەکی یاساو ڕێسای زوان دەتوانین ناوی لێکدراو، گریَ، دەستەواژەو ڕستە دروست بکەین، بەو ئاوایەش دکارین بە کۆمەکی یاساو ڕێساکانی (گوتار) ،ڕستەکان بە جۆریَ دەربڕین کە پەیوەندیان بە یەکەوە هەبیَ و گویَگر یا خوێنەر زۆر بە سانایی لە ڕستەیەکەوە بچێتە سەر ڕستەیەکی دی و پەرەگرافێك چێبکەن کە ڕستەکانی پەیوەندی لۆجیکی و دروستیان بە یەکەوە هەبیَ و پەرەگرافەکە روون و ڕەوان و هاوئاهەنگ بێت. ئیدی بە کۆمەکی ڕێساکانی گوتار دەتوانین پەرەگرافەکان بە جۆرێکی لۆجیکی بدەینە دەم یەکەوەو لە ئەنجامدا دەقێکی گونجاوی روون وڕەوان و مەفهووم بە دەستەوە بدەین. ئەمەش بۆ ئەوەیە کە گوتاری دەقەکە کاریگەر بیَ.بەلاَم لەو سەری دەقەکە موخاتەبێك هەیە کە دەبیَ ئەو دەقە وەخوێنیَ یان گوێی لیَ بیَ. کەواتە بەم پێیە گوتار دەکاتە چۆنیەتی بەرهەمهێنان و ڕێکخستنی دەقێك لە لایەن بەرهەمهێنەرێك و چۆنیەتی تێگەییشتنی ئەو دەقە لەلایەن وەرگرەوە.جا لەم حاڵەدا دەبیَ هەردوو جەمسەرەکە، واتە هەم بەرهەمهێنەری پەیامەکە و هەم وەرگری پەیامەکە لەو ئاستەدا بن کە پەیامەکە بە شێوەیەکی کاریگەر بگوازرێتەوە. لە غەیری ئەم حاڵەتەدا پەیامەکە یا ناگاتەجیَ یان بە نیوەچڵی و نامەفهوومی دەگاتەجیَ.

دیارە گوتار بەتەنیَ و هەر خۆی ناکاتە دەق،بەڵکو کۆمەڵێك رەگەزو پێویستی و هەلو مەرجە هەر کاتێك یەك بگرن، دەق و تێکست پێکدەهێنن. واتە دەق بەرهەم و بەرەنجامی گوتارە. گوتار رەگەزێکی دینامیکی و نەوەستاوە، دەق وەستاوە. پرۆسەی گوتار تا دواساتی خۆی، واتە تا دەمی دروستبوونی دەق، هەموو کاتێك موخاتەبی لە بەرچاو ولە بیرو خەیاڵە، بەبیَ موخاتەب لەجێی خۆی دەچەقیَ وناچێتە پێشیَ. داهێنەری قسە هەمیشە دەبیَ موخاتەبی گریمانەیی خۆی لە هزرو بیر بیَ. ئەگەر وانەبیَ گوتار رەوتی سیستەماتیکی خۆی وەرناگریَ و دەق یەکێتیی هونەری خۆی وەرناگرێت..

((٣))

کەواتە نووسەری سەرکەوتوو، ئەو نووسەرەیە هەمیشە لە پرۆسەی نووسیندا موخاتەبی گریمانەیی ( گوێگر یا خوێنەر)ی لە زەینیدا بێت. جا لەمەوە پرەنسیپی هاوکاری دێتە گۆڕیَ، پەیوەندی زوانەوانی دێتە ئاراوە. جا باسی زوان نابیَ تەنیا لە سنوری رستەدا بوەستیَ. چونکە یەکەی زوان تەنیا ڕستە نییە، بەڵکو کۆمەڵە یەکەیەکی گەورەتر لە زمان هەن کە د ەق پێکدێنن و ئەمەش بەرەو زوانناسی دەقمان دەبات..زماننناسی دەقیش ئەوەندەی سەروکاری لەگەڵ بەلاغەت ودەقدا هەیە، ئەوەندە سەروکاری لەگەڵ فەساحەت و ڕستەدا نییە. واتە فەساحەت پتر لە ڕستەدا بەرجەستە دەبیَ ،بەلاَم بەلاغەت زیاتر لە دەق دا بەرجەستە دەبیَ. کەواتە بەم پێیە ئەوەندەی بۆ بابەتەکەی ئێمە پێویست بیَ، هەر جۆرە پەیوەندییەکی زوانی دەوەستێتە سەر پرەنسیپی هاوکاری. بێژەرو بیسەر، نووسەرو خوێنەر لە هاوکاری بەردەوامدان. چونکە ئەگەر ئەم هاوکاریە نەبیَ پەیوەندی دروست نابێت.. ئەگەر هاوکاری نەبیَ، زوان چەند رەوان وڕەسا بیَ، کارێکی ئەوتۆی لە دەست نایەت.. جا بۆ هەر پەیوەندییەکی دروست و ساغڵەم کۆمەڵێك مەرج پێویستن لەوانە: چەندیەتی، چۆنیەتی، پەیوەندی ،شێوەی گوزارشت و دەربڕین. هەرکاتێك ئەو مەرجانە

ڕەچاو بکرێ،وەرگر چ بیسەر بێ چ خوێنەر ئەگەر پابەندی پرەنسیپی هاوکاری بێ، بە ئاسانی دکارێت مەبەست و پەیامی بێژەر یا نووسەر دەرك بکات و تەفاعولی لەگەڵدا بکات. مەبەست لە چەندیەتی ئەوەیە بەئەندازەی پێویست بڵێین، نەزیاد و نەکەم. چۆنیەتیش ئەوەیە کە پێویستە گوتەکانمان دروست بێ، یان بەلای کەمەوە خۆمان باوەڕمان بە دروستییەکەی هەبێ. پەیوەندی ئەوەیە ئەو قسەیەی دەیکەین پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەبێ.. شێوەی دەربڕین و گوزارشت، چ قسە بێ چ نووسین دەبێ هاوئاهەنگ و گونجاو بێ.. هەڵبەتە وەرگر دەبێ هەمیشە ئەوەی لە هزرو خەیاڵدا بێ کە بێژەر یا نووسەر هەرگیز ئەوەی مەبەست نیە گوێگر یا خوێنەر چەواشە بکات و تووشی سەرەگێژکەی بکات. بۆیە ئەگەر تووشی بوو بە تووشی دەقێکەوە کە بە رواڵەت پەیوەندی بە بابەتەکەوە نەبێ ، دەبێ بۆ هۆی نەبوونی پەیوەندییەکە بگەڕێ و لەم ڕێگەیەوە بەشێکی فرەی هەر پەیوەندیەکی زمانەوانی چێدەبێت. واتە بەشێکی تەواوی پەیامەکە لە لایەن موخاتەبەوە بەرهەم دەهێنرێتەوە. بەلأم ئەوەش هەیە کە خودی زمان، یان زمان بەتەنێ هەر ڕێژەیەکی کەمی زانیارییان لە خۆ دەگرێت. ئەو باقیەکەی موخاتەب یان وەرگر بە زەبری مەزەندەو مەعریفەتی شەخسی خۆی پڕی دەکاتەوەو قەرەبوی دەکات. چونکە وەرگری چاك بەوە قایلە کە زوان نابێ لە ڕادەبەدەر بە شرۆڤەو رونکردنەوە باربکرێ،وکورتبڕی یەکێکە لە خەسڵەتەکانی زەینی بەشەر، جا ئەم کورتبڕییە مەسەلەی گوزارشتی ناراستەوخۆی لێدەکەوێتەوە بەتایبەتی لە واری ئەدەبیات و کارێن ئەفرندنەوانی دا، کە ئەمە ئەفسوون و کاریگەرییەکی پتر بە دەق دەبەخشێت، و زمانی ڕەمزو ڕەمزکاری دێتە گۆڕێ کە تەنیا لە ڕێگەی زوانی ناڕاستەوخۆوە بەرجەستە دەبێت.

((٤))

بەگوێرەی پرەنسیپەکانی هاوکاری، دەبێ هەر دەقێکی زارەکی یا نووسراو مەرجەکانی چەندیەتی، چۆنیەتی، پەیوەندی و شێوازی گوزارشتی تێدا بێ ویەیڕەویان بکات، دەنا دەبێت بە کۆمەڵێك وشەو رستەی بێسەرو بەر و هەڤدژو لە دەقایەتی دەکەوێ. واتە هاوکێشەیەك هەیە کەبریتیە لە دوو جەمسەری پەیوەندی .جەمسەری پەیامنێر(مرسل) جەمسەری پەیام وەرگر. ئەم دوو جەمسەرە دەبێ لە حاڵی هاوکارییەکی ئازادانەی بەردەوامدابن،تا پەیوەندییەکە چێببێ.جا ڕەچاوکردنی ئەو مەرجانەی لەسەرێرا ئاماژەمان کردنێ، زەمانەتی بەرقەراری پەیوەندی دەکەن.. هەڵبەتە ئەندازەو چوارچێوەی ئەو مەرجانە رەنگە وەرگر (گوێگر یا خوێنەر) دیاری بکات، هەڵبەتە هەر دەقێك لە زوانی ئەسڵیدا یانی لە زمانی یەکەمدا بۆ خەڵکانێکە یا خەڵکانێك دەدوێنێ کە مەرج نییە خەڵکانی زوانی دووەمی ئەو دەقە ، واتە دەقەکە بە وەرگێڕدراوی هەمان ئاست و تایبەتمەندی خەڵکانی زوانی یەکەمی دەقەکەیان هەبێ. ئەمە خۆی لە خۆیدا یەکێکە لە گرفتە عاسیەکانی وەرگێڕان و هەر دەشمێنێ. بۆ نموونە زۆر دوورە نووسەرێکی میناکی هەمینگوای لە کاتی نووسینی رۆمانەکانیا جگە لە خوێنەری ئینگلیزی زمان ،خوێنەری غەیری زمانی ئینگلیزیشی لە هزرو زەیندا بووبێ. کەواتە وەرگێڕ ناچار دەبێت، لە کاتی وەرگێڕاندا،تایبەتمەندی خوێنەری زمانی دووەم ڕەچاو بکات و بۆ ئەمەش ناچارە هاوتای

دەستەواژەو زاراوەو ئیدۆمانی زمانی یەکەم، لە زمانی دووەمدا، زوانی وەرگێڕان، پەیدا بکات و بدۆزێتەوەو تەنانەت دابتاشێت.بەمەش پرەنسیپی ئەمانەتداری وەرگێڕان، وەکو هەندێ کەس تێی گەییشتون لەق دەبێت. هەڵبەتە پرەنسیپی ئەمانەتداری و وردی بەو شکییە زادەی مامەڵەی نادروست و میکانیکییە لەگەڵ وەرگێڕاندا کە داوا دەکات لە بەرانبەر هەر رەگەزو توخمێکی ناو زمانی یەکەمدا، هەمان رەگەزو توخم لە زوانی دووەمدا دابنرێ، دیارە ئەمانە غافڵن لەوەی سیستەمی گوتاری هەر زمانێك لە رووی بونیادەوە جیاوازە لە زمانێکی دیکەو هەر کاتێك ئەو بونیادە بەهەر بیانوویەکەوە، بە تایبەتی بە بیانووی زەرورەتی ئەمانەتداری و وردی لە کاری وەرگێڕان، شێوێنرا، پەیوەندی دروست نابێت و گوتار چێ نابێت، خوێنەر لە دەق تەوەلا دەبێت ، وەکو ئەمە لە بەشێکی زۆری کاری وەرگێڕانی ئەمڕۆی بواری چالاکی رۆشنبیریی کوردیدا بەدی دەکرێت. جا تا زەمینەی رۆشنبیریی دوو زوان پتر لێکدی جیاوازبن، مەسەلەی زیادکرن و کەمکرن دەمێنێ و هەر وەرگێڕانێك پەنا وەبەر ئەو میکانیزمە (زیادکردن یا کەمکرن) هەڵبەتە بەرێژەیەکی زۆر حەساو بۆ کراو، نەبات پچڕ پچڕو نارەوان و نامەفهووم دەنوێنێ. هەماهەنگی بەلاغی پێ دروست ناکرێت. هەماهەنگی بەلاغی دەکاتە پەیوەندی نێوان پاژەکانی دەق، کە لەسەر بنەمای کۆمەڵە فاکتەرێکی دەرێی دەق دروست دەبێت، وەکو پرەنسیپی هاوکاری ،جا هەرکاتێ دەق نەتوانێ باشترین هاوسەنگی لە نێوان کەمبێژی (ئیجاز)و درێژدادڕی تاقەتبەر دروست بکات، ناکرێ ناوی دەقی لێ بنرێ. با هەر ڕستەکانی لە رووی دەستوورییەوە دروست بن . واتە هەر پەرەگراف و پارچەیەکی زمانی چەند لە رووی دەستورەوە دروست و بێ خەوش بێ، ناکرێ بە دەق بژمێردرێ..گونجان و هەماهەنگی بەلاغی دیاردەیەکی رۆشنبیرییە، لە کەلتورێکەوە بۆ یەکێکی دی دەگۆڕێت و جیاوازە. هەر دەقێك خەڵکی خۆی هەیە و خەڵکی خۆی دەدوێنێ. هەر کاتێك بخرێتە بەر دەست کەسانێك کە موخاتەبی خۆی نەبن، نایەتە دەرککردن. هەڵبەتە یەکێك لە مەسەلە دژوارەکانی وەرگێڕان ئەم دیاردەیەو چۆنیەتی چارەسەری ئەم دیاردەیەیە.جا بۆ ئەوەی گوتارێك، یا نووسینێك دەقایەتی پەیدا بکات، ببێ بە دەق، لە کاتی وەرگێڕاندا بمانەوێ و نەمانەوێ دەبێ دەستکاری زمانیی– بەلاغی بکرێت.چونکە گوتار لە کەلتورێن جیاوازدا، بەگوێرەی دووری و نزیکی ئەو کەلتورانە لێکدی، جیاواز دەبێ و جیاوازە.بۆیە بارکردنی بونیادی خیتابی زمانێك، لە زمانێکی د یکە پەیدابوونی دەقی لێناکەوێتەوەو شتێکیش کە دەقایەتی پەیدا نەکات ، یا نەبێت بە دەق، بە تەواوەتی دەرك ناکرێت.. جا لێرەدا هەر دەقەکە بە رووتی وەرناگیرێت، بەڵکو شێوەی گەیاندنی پەیامی دەقەکەش بۆ خۆی پرەنسیپێکەو دەبێ ڕەچاو بکرێ. بێگومان شێوەکانی پەیام گەیاندنیش لە کەلتورێکەوە بۆ یەکێکی دی جیاوازە، و ئەمە لە زواندا ڕەنگدەداتەوەو کاریگەری خۆی دەبێت. کاتێ دوو کەلتور، دوو زوان،یان دوو وتار بۆ یەکتر بگوازرێنەوە، دەبێ دەستکاری شێوەی گەیاندنی پەیامەکانیان بکرێ، دەنا دەقە ئەسڵەکە بە جۆرێ پەڕو باڵ دەکرێ کە نە دێتە تێگەییشتن و نە دەناسرێتەوە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە سیستەمی بەلاغی زمانان

چوونیەك نیەو لەم حاڵەتەدا –هەڵبەتە لە کاری وەرگێڕاندا– دەستکاری کردنی لە قایدە نەك هەر پێشێلکردنی ئەمانەتداری نیە، بەڵکو پاراستنی رۆحی ئەمانەتدارییە.

((٥))

بە شێوەیەکی گشتی وەرگێڕانی وشە بە وشە،یەکێك لە خەوشەکانی ئەمەیە کە وەکو پێویست چەمك و مانا ناگەیەنێ و نادات بە دەستەوە. زیاتر بونیادو پێکهاتەی زمانی یەکەم دەسەپێنێ نەك چەمك و ماناکەی بەرجەستە بکات. رەنگە لەم بارو حاڵەدا پتر بەکای لێکۆڵینەوەی زمانەوانی بێت تا گواستنەوەی چەمك و مانای رۆشنبیری. رەنگە وەرگێڕانی وشە بە وشە زیاتر لای ئەو کەسانە پەسند بێ کە زمانە یەکەمەکە دەزانن، و لە کاتی خوێندنەوەی زمانی وەرگێڕانەکەدا ،لە هزری خۆدا جۆرە بەراوردێکی ڕێزمانیان لا دروست دەبێ و زمانی وەرگێرانەکە باشتر لەو کەسانە تێدەگەن کە زمانە یەکەمەکە نازانن.. بەلاّم زمانان لە رووی رێزمانیشەوە هەر جیاوازیان هەس.بۆیە هیچ وەرگێڕانێکی وشە بەوشە بە تەواوەتی رەوان و مەمەفووم دەرناچێت. جا پابەندی زیاد لە پێویست بە بەرجەستە کردن و گواستنەوەی بونیادی وشەوانی و دەستوری هەر زوانێك، دەکاتە کارێك کە چەمك و پەیامەکەی روون و ڕەوان نەبێت. واتە لە پرۆسەی وەرگێڕاندا چەند بمانەوێ پەیامی دەقەکە ئاسانترو رونترو مەفهوومتر بگەیەنینە وەرگر ، ئەوەندە لە بونیادی وشەوانی و رێزمانی زمانی یەکەم دوور دەکەوینەوە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو دوو زمانە لە یەك خێزانە زمان نەبن. جا ئەمە کێشەیەکی زاڵە و رەنگە هەر وەرگێڕێك بە جۆرێ مامەڵەی لە تەکدا بکات.رەنگە باشترین چارەسەر بۆ ئەم کێشەیە ئەوەبێ کە وەرگێر یان کەسێکی دیکە بێت پێشەکییەکی تێروتەسەل بۆ دەقە وەرگێڕدراوەکە بنووسێت کە شارەزایانە رێنوێنی خوێنەر یا وەرگر بکات بۆ ناو دنیای دەقەکەو ئاسانکارییەکی ئەوتۆی بۆ بکات کە بەئاسانی بەرهەمەکە دەرکبکات و لێی حالّی ببێ و لەزەتی لێوەربگرێت.. بێگومان پێشەکی نووسینیش شارەزاییەکی چاکی دەوێ.. بەهەرحالْ ڕەنگە وەرگێڕانی بابەتێك لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی دیکە بەبێ هیچ جۆرە دەسکاریی یان سوکە دەسکارییەك ، یەجگار دەگمەن بێت.. بۆیە ئەگەر وەرگێڕێك خۆی لە ئاستی تێگەییشتنی مەبەستی نووسەردا بە بەرپرسیار بزانێ، یان بە گوتەیەکی دی تێگەییشتنی مەبەستی نووسەر بە ئەرکی خۆی بزانێ و بەسەر بابەتی وەرگێڕانەکەدا زەبەر دەست و زالْ بێ، ئەمە خۆی لە خۆیدا هەنگاوە بەرەو دانەرایەتی ، واتە وەرگێڕ لەم حاڵەتەدا بۆ ئاستی دانەر نزیك دەبێتەوە. هەڵبەتە دەبێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە وەرگێڕ تا رادەیەکی زۆر گیرۆدەی چوارچێوەی دەقە، بەلاّم هەر دەقێك لە شوێنی خۆیدا و لە زمانی ئەسڵدا گوتاری خۆی هەیە و خەڵکانێك دەدوێنێ و پەیامێك دەگەیەنێ. ئەگەر لە زمانی دووەمدا، واتە لە زمانی وەرگێڕاندا، گوتارو موخاتەب و پەیام نەما، ئەمە خۆی لە خۆیدا نیشانەو بەڵگەی ناکامی ئەو وەرگێڕانەیە. بۆیە ڕەنگە مەسەلەی دەهمەنووسی و پەراوێز بۆ هەندێ دەقی لە ئەسڵدا قورس، لە پرۆسەی وەرگێڕاندا کارێکی باش بێ و مەسەلەی گوتارو موخاتەب و پەیام دابین بکات و جۆرە ئاسانکارییەك بێ بۆ خوێنەر کە دەقەکە لە زمانی دووەمدا

باشتر دەرك بكات. بەلاّم وەرگێڕ دەبێ ڕێزی خوێنەر بگرێت و شتێك بۆ زیرەكی خوێنەر بێلێتەوەو بزانێ لە كوێدا پەنا بۆ پەراوێز بەرێ و لە كوێدا بۆی نەبات.

((٦))

كەواتە لە كاری وەرگێڕاندا، بەحوكمی جیاوازی زمانی یەكەم ودووەم، بە حوكمی تایبەتمەندی زمانەوانی و گوزارشتی زمانی یەكەم و دووەم، بەحوكمی جیاوازی بونیادو پێكهاتەی هەردوك زمان، بمانەوێ و نەمانەوێ جۆرە دەسكارییەكی زمانەوانی و گوزارشتی خۆی دەسەپێنێ، ڕادەی ئەم دەسكارییەش پەیوەستە بە ڕادەی دووری و نزیكی كەلتوری و گرێكوێرە زمانەوانییەكانی هەرتك زمانەكە لە یەكدی.. بۆیە هەركەسێك كە بچێتە مەیدانی وەرگێڕان، دەبێ كەرەستەو ئامرازی تێگەییشتنی ڕازو ڕەمزو نهێنییەكانی دەقە ئەسڵیەكەی پێبێ، بتوانێ نهێنییەكانی دەقی یەكەم كەشف بكات، هەڵیوەشێنێتەوەو لە قاڵبی زمانی دووەمداو بە گوێرەی بونیادی دەستوری زمانی دووەم دایڕێژێتەوەو دەقایەتییەكەی بپارێزێ، كە ئەمە خۆی لە خۆیدا جۆرە دەسكارییەك دەخوازێت كە پێم وایە هیچ وەرگێڕانێكی باش ناتوانێ خۆی لێ بدزێتەوە. چونكە وەرگێڕان لە خودی خۆیدا، گواستنەوەو گوێزانەوەیەكی دەسكاری كراوە. هیچ وەرگێڕانێك چ لە ئاستی تیۆری و چ لە ئاستی پراكتیكی، دەقاو دەق چوون ئەسڵەكە نییە. بۆیە وەرگێڕانی هەر دەقێك بەشێوەیەكی گشتی دەبێ هاوتای ئەسڵەكە بێ، ئەمەش وردەكاری وزەحمەتێكی زۆری گەرەكە، دیارە گوتاری هەر زمانێك جیاوازە لە زمانێكی دی، جا ئەم جیاوازییە، لە كاری وەرگێڕاندا جۆرە بۆشاییەك دروست دەكات كە پێویستە ئەو بۆشاییە پڕ بكرێتەوەو ئەمەش بەو وردە دەسكاریانە پڕ دەبێتەوە كە باسمان كردو بەبێ ئەمە هیچ وەرگێڕانێك دەقایەتی وەرناگرێت و ڕەنگە نەشێت لە زمانی دووەمدا ناوی دەقی لێ بنرێت، كە نەشبوو بە دەق هەرگیز دەرك ناكرێت و نایەتە تێگەییشتن،كە ئەمە حاڵی زۆر كاری وەرگێڕدراوی بواری چەلەنگی ڕۆشنبیریی كوردیمانە.

كەواتە زەرورەتی دەسكاری یا وردە دەسكاری لە كاری وەرگێڕاندا زادەو بەرەنجامی جیاوازی نێوان كەلتورو زمانەكانە،تا ئەم كەلتورو زمانانە زیاتر لێكدی دوورو جیاواز بن، ڕادەی وردە دەسكاری زیاتر دەبێت. دیارە پێچەوانەش پێچەوانەیە.. بۆیە جێی خۆیەتی لێرەدا و هەر بۆ پشتیوانی ئەو بۆچوونانەی سەرێ ئاماژەیەك بۆ پێناسەیەكی (نایدا) لەمەڕ وەرگێڕان بكرێ كە پێی وایە وەرگێڕان بریتیە لە دۆزینەوەی ((نزیكترین هاوتای)) زمانی یەكەم ،لە زمانی دووەمدا. جا دەستەواژەی ((نزیكترین هاوتا))لێرەدا زۆر گرنگە، چونكە ئەوە دەگەیەنێ كە لە وەرگێڕاندا شتێك نییە بە نێوی هاوتای تەواو یان هاوتای موتڵەق، بەڵكو ((نزیكترین هاوتا ))هەیە. دیارە ئەم دەستەواژەی ((نزیكترین هاوتایە)) تەنیا لە ئاستی وشە یان پەیڤدا نیە،بەڵكو شێوازیش دەگرێتەوە.. بۆ نموونە ڕەنگە دەقێكی مینا ئیلیادە یا ئۆدیسەی هۆمەر بە زمانی تازەی ئەمڕۆكە بێتە وەرگێڕان كارێكی زۆر پەسند نەبێت، خۆ ئەگەر بە زمانێكی كۆنی ئەوتۆش وەربگێڕدرێت كە خوێنەری ئەمڕۆ لێی تێنەگات، ئەوا عوزر لە قەباحەت خراتر..بۆیە ناچار دەبێ پەنا وەبەر چارەسەرەكەی (نایدا) ببرێ و ((نزیكنترین هاوتا))ی ئیلیادەو ئۆدیسە چ لە ئاستی واژەو زمان چ

لە ئاستی شێوازو گوزارشت بدۆزرێتەوە. دیارە زۆربەی شارەزایانی بواری وەرگێڕان پێیان وایە کە هاوتای موتڵەق نیە. ئەوەی بە هاوتا دادەنرێ تەنیا ((نزیکترین هاوتا))کەی (نایدا)یە.جا هەر هەموو دەسکاری یا وردەدەسکاریەکیش تەنیا لەو سنوورەدا قبوڵ دەکرێت. چونکە دەقی وەرگێڕدراو هەرچییەك بێ دەبێ ئەوەی پێوە دیار بێ کە وەرگێڕانە. چونکە هەرگیز جیاوازی گوتار (خیتاب) بە تەواوەتی لەبەین ناچێت و لە نێو نابرێ. بۆیە وەرگێر لەم پێودانگەوە دەبێ ئەوپەڕی توانای خۆی بخاتە کار تا ماناو چەمکێن فەرهەنگی لە قاڵبی زمانی زکماکیدا بگەیەنێ و بەرجەستە بکات، چونکە وەرگێڕان زیاتر بۆ ئەو کەسانەیە کە زمانی ئەسڵی دەقەکە نازانن.

((٧))

پێموایە هەر دەقێك بگری بۆ وەرگرانی تایبەتی خۆی دێتە نووسین، یانی هەر دەقێك کۆمەڵە خەڵکێکی تایبەتی دەدوێنێ، جا یەکێك لە مەرجەکانی وەرگر یا دوێنراو یا موخاتەب ئەوەیە کە دەبێ زمان بزانێ، واتە زمانی دەقەکە بزانێت و ئاگاداری ئەو ژینگە کەلتورییە بێت کە بەرهەمەکەی تیا لە دایکبووە.هەر دەقێکیش گوتاری خۆی هەیە، پەیامدارو پەیام وەرگر لە جیهانی دەقدا دەگەیەنێتە یەك.. بۆ نموونە وەختێ بەرهەمێك لە ئەمریکا بڵاو دەبێتەوە، زیاتر رووی دەمی لە ئەمریکاییەکانە، بەڵام هەر هەمان بەرهەم لە لایەن هەموو ئینگلیزی زمانانی جیهانیشەوە دەخوێنرێتەوە، خۆ لە حاڵی وەرگێڕانیدا بۆ زمانەکانی جیهان، لە سەرانسەری جیهاندا موخاتەبی خۆی پەیدا دەکات، واتە هەموو خەڵکی جیهان دەدوێنێ.. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر ئەو راستیە باقیە کە ئەوبەرهەمە بەر لە هەرکەسێك بۆ ئەمریکاییەکان نووسراوە، تەنانەت لە حاڵی یەکسانبوونی هەلومەرجەکانیشدا هەوەڵجار ئەمریکاییەکان، ئەوجا ئینگلیزەکان، دواتر هەموو ئینگلیزی زمانانی جیهان و دوای وەرگێڕان هەموو میللەتان، هەر یەکەیان بە گوێرەی نزیکی ئاستی زانست و رۆشنبیری و کەلتوریان لە زانست و کەلتوری ئەمریکا، ئەم دەقە باشتر تێدەگەن، واتە دووری و نزیکی لە یەکدی کار دەکاتە سەر ڕادەی تێگەییشتن لە دەقەکە. کەواتە جیاوازی گوتاری نووسین لە کەلتووره جۆراوجۆرەکان دا بۆ خۆی گرفتێکی گەورەیە لە بەردەم کاری وەرگێڕاندا.بۆیە وەرگێڕ لە سەرێتی بەگویرەی توانای خۆی ئەم گرفتە بەشێوەیەکی دروست و هونەری بۆ خوێنەرانی چارەسەر بکات، دەبێ وەرگێڕ وای دابنێت بۆ کەسانێك تەرجەمە دەکات کە زانیاریان لەمەڕ ئەو بەرهەمە و ژینگەی رۆشنبیری ئەو بەهەمە لە زانیاری ئەو کەمترە. دیارە ئەم دیاردەیە یان گرفتە زادەی جیاوازی گوتارە لە کەلتورە جۆراوجۆرەکاندا، بۆیە چارەسەری ئەم گرفتە بمانەوێ ونەمانەوێ قاڵبشکێنی لە زمانی یەکەم و قاڵبڕێژی لە زمانی دووەمدا گەرەکە، کە خۆی لە خۆیدا دەکاتە دەسکاری یا وردە دەسکاری . کەریمی ئیمامی کە وەرگێڕێکی نێوداری ئێرانیە دەلێت: "بەندە بە ئەزموونی شەخسی خۆم کە وەرگێڕێکی دوو زمانەم، بۆم دەرکەوتووە کە وەرگێڕانانی بێتوانا زیاتر بە دەقەوە دەچەسپن و تاقە وشەیەك کەم و زیاد یا پاش و پێش ناکەن.." دیارە وردی و ئەمانەتداری ئەمە نییە، وردی و ئەمانەتداری ئەمەیە کە بابەت و پەیامەکە بە شێوەیەکی تەواو بگوازرێتەوەو ئەمەش بە هیچ جۆرێ بەو مانایە نیە کە نابێ تاقە وشەیەك لە دەقی زمانی یەکەمدا بەبێ وەرگێڕان بمێنێتەوە

یان چ وشەیەك نەهێنرێتە ناو زمانی دەقە وەرگێڕدراوەکەوە کە هاوتایەکی لە دەقە ئەسڵەکەدا نەبێت.بەڵکو وەرگێڕ بۆی هەیە قاڵب و سیستەمی ڕستەبەندی زمانی یەکەمی دەقەکە بشکێنیّ و لە قاڵب و سیستەمی رستەبەندی زمانی دووەم دا دای بڕێژێتەوەو دەقایەتی پێ ببەخشێتەوەو کە ئەمە بەبیّ وردە دەسکاریی زۆر وەستایانە هەرگیز نایەتە دی. یانی لەم حاڵەدا، دەق وەکو یەکەیەکی یەکپارچە لە لایەن وەرگێڕەوە مامەڵەی لە تەکدا دەکرێت، وەرگێڕ سەراپای دەقەکە دەپشکنیّ، پەناو پاسارەکانی، نهێنی و گریّ کویرەکانی کەشف دەکات، دەیخاتە بەر وردەبینی لێکۆڵینەوەوە، ئەوجا دێت گونجاوترین میتۆد بۆ وەرگێڕانی هەڵدەبژێریّ. کەواتە بونیادو پێکهاتەی وشەوانی و دەستوری وبەلاغی دەق، هەر دەقێك لە زمانە جۆراوجۆرەکاندا جیاوازە، بۆیە رەچاو نەکردنی ئەم جیاوازیانە لە کاری وەرگێڕاندا، دەقێکی گۆج و ئیفلیجی وای لێدەکەوێتەوە کە ناکریّ نێوی دەقی لیّ بنریّ. چونکە دەق یەکەیەکی یەکپارچەیە، بە تێکڕای رەگەزو ئەندامەکانی دەقایەتی پەیدا دەکات، هەر ئەندام یا ڕەگەزێکی کەم بیّ، لە دەقایەتی دەکەویّ و دەبێت بە کۆمەڵە دەستەواژەو رستەیەکی ناڕەوان و نیمچە مردووی ئەوتۆ کە دەقیان لیّ پێکنایەت،و کە دەقیش پێك نەهات، هیچ کاریگەرییەکی نابیّ و ناخوێنرێتەوە.. کەواتە سروشت و تەبیعەتی وەرگێڕان لەبەر رۆشنایی ئەو بۆچوونانەی سەریّ، ڕێگە بە وەرگێڕ دەدات لە سنورێکی دیاریکراودا و زۆر وەستایانە دەسکاری بەرهەمەکە بکات، بۆی زیاد بکات و لێی کەم بکات، بە قەولی تایتلر، ئەدیبی ئینگلیزی، وەرگێڕ کاتیّ روحی بەرهەمەکەی ناسی " بۆی هەیە وەکو خودی نووسەرەکە مامەڵەی لەگەڵ بکات" واتە هەر وەرگێڕانێکی باش پێویستی بە دەسکاری زمانی هەیە. رەنگە ئەم دەسکارییە زادەی گوشاری رۆشنبیریی زمانی دووەم بیّ، واتە زمانی دووەم ئەم دەسکاریە دەخوازێت. بەلاّم دەبیّ هەمیشە رادەی دەسکاریەکە لە ئاستی هەرە کەمدا بیّ، چونکە وەرگرانی زمانی دووەمیش دەخوازن ئاگایان لە هزرو هزرین و داب و نەریت و خولیاو کەڵکەڵەو رەفتاری خەڵکانی دی هەبیّ.

هەڵبەتە رادەی دەسکاری لە وەرگێڕاندا بە گوێرەی کات و شوێن دەگوڕیّ.رەنگە بە حوکمی ئەوەی لە رۆژگاری ئەمڕۆدا کە میللەتان لە یەکدی نزیك بوونەتەوەو گوتاری رۆشنبیریی میللەتان لە یەکدی نزیك بووەتەوەو دەتوانن زۆر لە جاران ئاسانتر لێکدی حاڵی بن، رادەی ئەم دەسکارییەی وەرگێڕان کەمترو کەمتر ببێتەوە. بەلاّم تا میللەتان بە تەواوی نەگەن بە یەکدی و نەبن بە خاوەنی یەك گوتاری رۆشنبیریی، دەسکاری بواری وەرگێڕانیش هەر دەمێنیّ. بەهەرحاڵ ڕادەی دەسکاری لە وەرگێڕاندا بابەتێکە کە وەرگێڕ لە میانەی کارەوە دەتوانیّ دیاری بکات. هەڵبەتە دەبیّ لێرەدا جەخت لەسەر ئەوە بکریّ کە وەرگێڕان نابیّ بەرادەیەك لە زمان و کەلتوری زمانی دووەم نزیك ببێتەوە کە خوێنەر یا وەرگر نەتوانیّ پەی بەسەرچاوە فەرەنگییەکەی ببات.چونکە ئەمە لادانە لە میتۆدی وەرگێڕان.لەبەر ئەوەی یەکێك لەو هۆکارانەی کە خوێنەر بۆ خوێندنەوەی بەرهەمێکی وەرگێڕدراو هاندەدات، حەزو کەڵکەڵەی ئاگادار بوونە لە چەندێتی و چۆنیەتی ژیانی خەڵکانێك کە لە شوێنێکی دیکەو بە کەلتورێکی جیاوازەوە دەژین..کەواتە وەرگێڕان نەدەبیّ ئەوەندە خۆمانی بیّ کە سەرچاوە بیانییەکەی ون ببیّ نە ئەوەندەش غەریب بیّ

كه خوێنەر یا وەرگر نامۆیی لێبكات و نەچێت بە لایەوە.واتە شتێكی مامناوەندی بێت، ئەمەش پتر لە رێگەی پێوەرو مەحەكە زمانناسیەكانی دەقەوە بە دەست دێ. بۆیە خوێنەری دەقی وەرگێڕدراو نابێ تەسەوری ئەوە بكات كە دەقی وەرگێڕدراو بە ئاسانی بخوێنێتەوە. دەبێ هەمیشە ئاگاداری ئەوەبێ كە دەقێكی بێگانە دەخوێنێتەوەو ئامادەی ئەوە بێ كە هەر دەمێك روو بەرووی بونیادو پێكهاتەی پێچەوانەی بونیادو پێكهاتەی زمانی زكماكی خۆی ببێتەوە.. هەڵبەتە ئەمە هەرچەند لە چوارچێوە گشتیەكەیدا دروست بێ، ئەوا لە پاژكاری و وردەكاریاندا یەجگار قورس و زەحمەتە، چونكە مەرج نیە خوێنەری دەقە وەرگێڕدراوەكە ئاشنای بونیادی زمانە بێگانەكە بێ، واتە زمانی یەكەمی دەقەكە.

هەڵبەتە جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژەیەكی خێرا بۆ ئەوە بكرێ كە لە واری چەلەنگی كاری وەرگێڕانی لای خۆماندا، ناو بەناو، لێرەو لەوێ، دەنگێكی ناساز بەناوی گوایە وردی و ئەمانەتداریەوە دژی هەر جۆرە دەسكاریەك لە وەرگێڕاندا بەرزدەبێتەوەو بەناهەق دۆو دۆشاو تێكەڵ دەكات و تەنیا وەرگێڕانی میكانیكی و پڕ وردەكاریی بێبایەخ بە وەرگێڕان دەزانێ، غافڵە لەوەی كە ورگێڕان پێویستی بە نەشتەرگەریی و دەسكاریی زمانی و بەلاغی هەیە..

جا وێڕای ئەوەی چ گومانێك لە زەرورەتی وەرگێڕان نیە، دەبێ ئەو ڕاستیەش بگوترێ كە وەرگێڕان ناتوانێ جێی نووسین ودانانی خۆماڵی بگرێتەوە، چونكە هەر میللەتێك دەبێ بتوانێ بە زمانی زكماكی خۆی بنووسێت و لە بوارە جۆراوجۆرەكانی ژیاندا بەرهەمی هەبێت،وناسنامەی نەتەوەیی و خۆماڵی خۆی هەڵگرێت، ئەمەش كاتێ دێتە دی كە بەزمانی زكماك و خۆماڵی بوارەكانی ژیان بەرهەم بهێنرێ.

لە كۆتاییدا دەبێ ئەوە بگوترێ كە وەرگێڕان هەرگیز نابێ بە ئەسڵ و كاتێ ئەسڵ هاتە وەرگێڕان ،ئیدی ئەسڵەكە،بەمانای وشەی ئەسڵ، نیە..

تێبینی: بۆ زانیاری زیاتر بنوارە:

١- در امدی به اصول وروش ترجمه ،چاپ سوم، ١٣٨٤ كاظم لطفی پور ساعدی
٢- گفتمان و ترجمه .علی صلح جو، چاپ اول، ١٣٧٧
٣- ڕۆژنامەی بارزان، ژمارە(٨٧) ئافاتی وەرگێڕان، حەمەكەریم عارف

# پێشەکی

(١)

ئەلبێر کامۆ لە ٧ی نۆڤەمبەری ١٩١٣ لە گوندی موندوڤی هەرێمی قەستەنتینەی جەزایر لە باوکێکی فەرەنساوی و دایکێکی ئەسپانی نەژاد لە دایك بووە، بابی وەرزێر بوو، لە شەڕی مارنی یەکەمدا هاتە کوشتن، دایکی لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا بێوەژن کەوت و هەر لە جەزایردا مایەوە، تا کارێ بۆ خۆی بدۆزێتەوە، ماڵێکی پەرپوتی لە گەڕەکی بلکوردا بەکرێ گرت، هەردوو کوڕەکەیو دایکی و خۆشکە کەڕە پەککەوتەکەشی لەگەڵیان بوون، ژیانێکی هەژارانەی دەگوزەراند، کوڕە چکۆڵەکەی –ئەلبێر– هەر لە منالیەوە هەستی بەم بێ دەرەتانییە کردو هەستی کرد کە هەژاران لە یەکێتی و بی دەنگیدا هاوچارەنووسن. بەڵام دوو شت باری قورسی ئەم هەژارییە سەختەی لەسەر شان سووك کرد، هەتاوو دەریا، هەتاوی گەرمی جەزایر، دەریای شین و مەنگ کە خەیاڵی فراوانی ئاوەدان دەکردەوە.

کەواتە کامۆ سەردەمی منالی و گەنجیی بە هەژاری و لە نێو هەژاریدا بەسەر برد، ناخی پڕ بوو لە هەستی زیرەکانەی چینی چەوساوە، هەست بە زۆرداری، تاڵی ناکۆکی و جیاوازی کۆمەڵایەتی نێوان چینەکان، لووت بەرزی دەوڵەمەندان، ئەم هەستانە بوونە مایەی یاخی بوون و شۆڕش دژی بارودۆخەکان.

بیری کامۆ لە مبارەیەوە تەنیا هەڵقولاوی خوێندنەوە نەبوو، بەڵکو پتر هەڵقولاوی ئەزموونی ژیانی خۆی بوو، ئەو ژیانەی لە سەردەمی مندالی و هەرزەکاریدا لە نێو کوچەو کۆڵانەکانی جەزایردا بەسەری برد، هەر بۆیە راستگۆیی لە گوزارشتەکانیدا، قووڵی لەباوەڕیدا، گەرمی لە هەناسەکانیدا بەدی دەکرێو دەبینرێ.

ئەوەی کە یارمەتی پڕانی بەهرەی کامۆی دا، مامۆستایەکی بوو لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بەنێوی جرمان، لەو مامۆستایانە بوو کە لە قوتابخانە سەرەتاییەکاندا قاڵ بوو بووەوە، بەڵام جمهوری خوایەکی دڵسۆزی سەرەتاکانی شۆڕشی ساڵی ١٨٤٨ بوو، هیوایەکی گەورەی بە رزگار بوونی چینەکان و بڵاو بوونەوەی سەرەتاکانی سوشیالیستی هەبوو، زیرەکی ئەم منداڵە هەژارە سەرنجی راکێشا، توانی مینحەیەکی خوێندنی لە اللیسیە بۆ دابین بکات.

لێرەدا، لە اللیسیە لە جەزایر کە جێگای منداڵە دەوڵەمەندەکان بوو، ئەم منداڵە زۆر زیرەکە هەستی بە ستەمی کۆمەڵایەتی کرد و دەرکی بەوە کرد کە لە ریزی کۆمەڵگادا جێی کوێیە. لە ریزی هاوولاتییە فەرەنساوییەکانی خۆیدا نییە، بەڵکو جێگای نێو ئەو زۆر لێکراوە موسوڵمانانەیە کە بە دەستی هەژاری و چەوساندنەوەوە دەناڵێنن، ئەلبێر کامۆ شەیدای وازی تۆپی پێ بوو، بوو بە گۆڵچی، گۆڵچییەکی هەرە چاکی قوتابخانەکەی خۆیان بوو، جاریکیان سەرمای بوو، ئەم سەرمایە لێی پیس کردو دووچاری پەنامی سییەکان بوو، نەخۆشییەکەی زیادی کرد و لێی کرد بە رەشە سیل و هەتا هەتایە لە کۆڵی نەبۆوە، بۆیە هەستی کرد ناتوانێ

پیشەی دەرس گوتنەوە لە ئەستۆ بگرێ. ئیدی پیشەی مامۆستایەتی لە خەیاڵی خۆی دەرکرد، چووە ریزی فەرمانبەرانی دەوڵەتەوە، یەکەم کارێ کە گرتییە ئەستۆ ئەوە بوو، بوو بە فەرمانبەر لە بەڕێوەبەرایەتی جەزایر. بەلاَم کاری رۆژانەی نێو دۆسیەی بێزارکەر رێی نووسینی ئەدەبی لێ نەگرت، دەستی بە نووسینی کورتە وتار کردو بە ناوی "شایی"ـەوە بلاَوی دەکردەوە، خووی دایە دامەزراندنی تیپێکی شانۆیی، زۆربەی ئەکتەرەکانی ئەو تیپە موسوڵمان بوون. شانۆ زۆری سەر قاڵ کرد، چ وەکو نواندن چ وەکو خوێندنەوە. لەو سەردەمەدا ئاشنایەتی لەگەڵ ئەدەبی دۆستۆفسکیدا پەیدا کرد، ئەو چیرۆکانەی کە لە خودی خۆیەوە نزیك بوون، هەر دووکیان باوەڕیان بە ئادەمیزاد هەبوو، هەردووکیان زۆر ناسك بوون، بە تایبەتی دەربارەی باری کۆمەلاَیەتی و گیروگرفتی دەوڵەمەند و هەژاران.
رۆژنامەگەری سەرنجی کامۆی راکێشا، هەر کە پەیوەندی بە رۆژنامەنووسی نووسەر –بسکال بیا– سەرۆکی نووسینی "الجزائر الجمهوريه" کرد ئیدی رۆژنامەگەری بوو بەخولیای، یەکەم وتاری سەرەکی کە کامۆ نووسی لێکۆڵینەوەیەك بوو دەربارەی کوێرەوەری کرێکاران، لەو وتارەدا باری کۆمەلاَیەتی ناهەمواری ئەو کرێکارانەی روون کردبووەوە کە لەبەر دەستی سەرمایەدارە داگیرکەرەکاندا کاریان دەکرد، کە هەموویان موسوڵمان بوون. دەسەلاَتی ئیستیعمار لە جەزایرو لەپاریسدا هەستیان بە مەترسی ئەمە کرد بە رێژەی داگیرکەرانەوە. لێرەدا دەبێ دان بەوەدا بنەین کە کامۆ یەکێك بوو لەو فەرەنساییانەی لە ریزی پێشەوە ویژدانیان راپەڕی دژی ئەو تاوانانەی کە داگیرکەری فەرەنسی دەیکردو هەروەها ئەمە جارێك بوو بۆ بەرپاکردنی شۆڕش دژی داگیرکەران.
کامۆ گواستییەوە بۆ پاریس. بوو بە سکرتێری نووسینی رۆژنامەی پاریسی ئێواران، لەکاتی کارکردندا سوور بوو لەسەر ئەوەی بەشداری ژیان و کارەکانی کرێکارانی چاپ و کۆکردنەوەی بکات، چونکە هەستی دەکرد ئەوانە زیاتر لێوەی نزیکن وەك لە دەستەی نووسەران.
کە دووەم جەنگی جیهانی بەرپا بوو، ویستی بەشداری جەنگ بکات، بەلاَم لەبەر نەخۆشی ئەمەی پێ نەکرا، دوای هەلاَتنەکەی فەڕەنسا لە پاریسەوە گواستییەوە بۆ "کليرموند فراند" لە نزیکی فیشی، هەروەها رۆژنامەی "پاریسی ئێواران"یش گواستییەوە، لەو دەمەدا لە ساڵی ١٩٤٠دا یەکەم چیرۆکی گەورەو بەناوبانگی خۆی نووسی، کە بریتی بوو لە چیرۆکی نامۆ، بەلاَم لە ساڵی ١٩٤١دا کەوتە بەر دیدەی خوێنەران.
ئەوجا چووە ریزی بزووتنەوەی "بەرەنگاری" دژی داگیرکەری ئەڵمانی، لە شانەی "خەبات"دا بەشداری کرد و بە نهێنی لە پاریس مایەوە، خۆی و دەستەیەك لە هاوڕێکانی بلاَوکراوەیەکیان بە ناوی "کومبا" (خەبات)ـەوە چاپ و بلاَودەکردەوە، زۆری نەبردو دوای ئازادکردنی پاریس لە ٢٤ی ئۆگستۆس–ی ساڵی ١٩٤٤دا ئەو بلاَوکراوەیە بوو بە رۆژنامەیەکی رۆژانەو بە زمان حاڵی "بەرەنگاری" میللی لە فەرەنسادا، لەو بەروارەوە ئەلبێر کامۆ بوو بە سەرۆکی نووسینی، بسکال بیای دۆستی بەڕێوەی دەبرد، هەروەها لە نووسیندا، سارتر، بال واستروك‌و ئولیفرو...هتد کە لەوەدووا گەیشتنە لوتکەی نێوبانگ بەشدارییان کرد. ئەم رۆژنامەیە رۆڵێکی یەکجار گەورەی لە

میانی لاوان و نەجەوانانی ئازار چەشتووی جەنگدا بینی، ئەو وەچەیەی بە تەمای ئەوە بوون دەرگای هیوای تازەیان لەبەردەما بکرێتەوە، بۆچوون و کەرەستەی خۆی هەبێ لە ژیاندا، هەر چەندە ئەم رۆژنامەیە زۆر بڵاونەبوو، بەڵام رۆڵی لە بارەی ئاراستەکردنەوە لە هەموو رۆژنامەیەکی دی گەورەتر بوو، کامۆ و دۆستەکانی تێیدا ماونەوە تا بارودۆخ لە فەرەنسادا گۆڕا، کە رۆژەکەی رۆژی بیرمەند و ئابڕومەند و خاوەن رای نوێ و چاکەکان نەبوو، بەڵکو رۆژی حیزبە هەلپەرستەکان بوو، وازی لەسەر نووسەری (کومبا) هێناو بە یەکجاری بەجێی هێشت، جێگای سەرسوڕمان نییە کە کابرایەکی جولەکەی تونسی کڕی و بە زووترین کات کردی بە رۆژنامەیەکی ئیستیعماریانەی کۆنەپەرستانەی بێ ئاست.

ئەستێرەی ئەدەبی و فیکری کامۆ دەستی بە بەرزبوونەوە و درەوشانەوە کرد بوو، ئەوو سارتر بوون بە دوو ئەدەرس بۆ بزووتنەوەیەکی رەسەنی نوێ لە ئەدەب و فیکری فەرەنساییدا، کامۆ بە دڵ و بە گیان خووی دایە نووسینی ئەدەبی، رۆمان و شانۆگەری و وتاری ئەدەبی یەك لە دوای یەکی بڵاو دەکردەوە. ئەوو سارتەری هاوڕێی بوون بەسەر ئامەدی بزووتنەوەی ئەدەبی و فیکری هەڵچوو لە فەرەنسادا.

لە هەڵوێستە رامیارییە دیارەکاندا دەنگی دژی زۆر و ستەم و هەموو جۆرە داگیرکەرێك بە گشتی و دژی داگیرکەری فەرەنسی لە باکوری ئەفریقادا بە تایبەتی بەرز دەکردەوە. هەرگیز عەرەب ناتوانن هەڵوێستە گەورەکانی دەربارەی بەرگری لە ئازادی تونس و مەراکیش دا بە تایبەتی ئەو دەمانەی کە سوڵتان محەمەدی پێنجەم لە ساڵی ١٩٥٤دا لێ خرا، فەرامۆش بکەن. ئەوجا بەرگری کردنی لە ماف جەزایر لە سەربەستی و دیاری کردنی چارەنووسی خۆیاندا، هەر چەندە هەڵوێستی دەربارەی گیروگرفتی جەزایر کەمتر روونە وەك لە گیروگرفتی تونس و مەراکش، چونکە هەر چەندە باوەڕی بە ماف جەزایرییەکان هەبوو لە دیاریکردنی ماف چارەنووسییاندا، مەبەست سەربەستییە، حەزیشی دەکرد، بە شێوەیەك پێوەندی لە نێوان جەزایرو فەرەنسادا هەبێ.

سەبارەت بەم هەڵوێستە جوانانەی دەربارەی بەرگری لە ئازادی و هێرش کردنەسەر زۆرو ستەم، سەبارەت بە بایەخی مرۆڤایەتی چیرۆکەکانی و سەبارەت بە دڵسۆزی بەرانبەر بە جاڕدانی دادوەری و قێزهاتنەوەی لە هێزی داگیرکەر لە ساڵی ١٩٥٧دا خەڵاتی نۆبلی پێ بەخشرا، ئەوو کبلنگ بچووکترین دوو کەسێ بوون کە خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرت، کە گەورەترین خەڵاتی ئەدەبییە لە جیهاندا.

کامۆ گەییە لوتکەی نێوبانگ، بەڵام ئەم نێوبانگە تەنیا دوو ساڵ دەوامی کرد، کامۆ لە ساڵی ١٩٦٠دا لە سەعات دوو کەم پێنج دەقیقەدا لە رۆژی ٤ی ینایری ١٩٦٠دا جیهانی بەجێهێشت و کۆچی دوایی کرد.

(٢)

کامۆ دەڵێ: مرسۆ–پاڵەوانی سەرەکی کورتە رۆمانی نامۆ– لە لام ئینسانێکی بەستەزمانە، ئەو هەتاوەی خۆش دەوێ کە سێبەر لە دوای خۆی جێ ناهێڵێ. (لە پێشەکی چاپە قوتابخانەییە

ئەمەرکیاییەکەی رۆمانی نامۆ ل٨ نیویورك١٩٥٥ ئیلتون ستیشری وەریگێڕاوە) لە راستیدا ئەو "هەستی بێ هودەییەی" کە لە وتارە فەلسەفەییە درێژەکەی "ئەفسانەی سیزیف"دا هاتووە لە مرسودا بەرجەستەیە، کەسێتی مرسۆ کە باسی ئەم هەستە دەکات لەم لایەنەوە سارتەر گوتەنی: تەتبیقی تیۆری رۆمانی بێهودەیە. ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکات کە بۆچی کەڵە رۆمان نووسەکان پابەندن بە رواڵەتە دیارەکانەوە، بۆ لە رێگای وێنەی هەست پێکراوەوە گوزارشت لە خۆیان دەکەن، لە بری ورد بوونەوەو حوکم دانی ژیری و مەنتقی، مرسۆ کە خۆی دەخاتە باوەشی رواڵەتە خالیسەکان و ئەزموونی راستەوخۆی زیندووەوە، لە راستیدا هەموو سیستەمێکی تەفسیرو لێکدانەوە رەفز دەکات، خۆی دەخاتە بیابانێکی خاڵی لە گشت دەلالەت و مانایەك چ شتێ بەلای ئەوەوە و بۆ ئەو نرخی نییە جگە لە واقعی ئێستای دیاری کراو، بەو حیسابەی زنجیرەیەکە لە لەحەزاتی لێك دابڕاوو رەوتەنی، چ واتاو و دەلالەتێ لە ئارادا نییە، ئێمە خۆمان لە دنیایەکی دەوڵەمەندی پڕ لە وێنەو رەنگ و هەستتدا دەبینینەوە کە چ پێوەندییەك بەیەکەوەیان نابەستێ و هیچ فیکرێ پەکیان ناخات. هەموو شتێ هەر چەند بچووك بێ نرخێکی تایبەتی و دیاری خۆی وەردەگرێ، هەموو وێنەیەك هەر چەند تەنیاو گۆشەگیر بنوێنێ، واتای خۆی وەردەگرێ.

مرسۆ بە شێوەیەك باسی خۆی دەکات وەك ئەوەی "یەکێکی تر" بێ، من "انا" لەلای ئەو وای لێدێت وەك ئەو "هو" بێ هەموو دەستەواژەیەك کە دەی درکێنێ، بە تاقی تەنیا دەوەستێ، چ پێوەندییەك بە دەستەواژەکانی دوای خۆیەوە نابەستێت، چ ماناو دەلالەتێك کۆیان ناکاتەوە، دەستەواژەکان پتر لەوەوە نزیکن کە ئیشارەتی خێرا بن وەك لەوەی یەکەی زمان یان فیکری بن. دەبێ بە کۆمەڵێ هەست و دەرکی سەربەخۆ، کە لە پاڵ یەکدا دانراون، سیستەمێکی فیکری دیار رێکیان ناخات، لە نێوان هەر دەستەواژەیەکدا، بۆشاییەك لە بێدەنگی و نەبوون هەیە. مرسۆ لە بەشی یەکەمی رۆمانەکەداو تا حوکمی خنکاندنی بەسەرا دەدرێ، هەست بە بێهودەیی ناکات. خۆ ئەگەر ئەم هەستی بێهودەییە ختوکەی ناخی یەکێك بدات، ئەوا ختووکەی ئەو خوێنەرە دەدات کە ئەم هەستی نائومێدی پڕ لە غوربەتە بە بێهودەیی رای دەماڵێ. خۆ ئەگەر شنەیەك دەربارەی هوشیاری لەلای مرسۆ پێویست بێ، ئەوا لەم قۆناغەدا جۆرێکە لە وریا بوونەوەی راستەوخۆ. زیاتر لەو شتە دەچێ، کە پێی دەڵێن فانۆسی سیحری، هەموو جارێ تیشکەکەی دەخاتە سەر وێنەیەك کە جیاوازە لەو وێنەیەی لە پێشییەوە هاتووە، وێنەکان بە دابڕاوی و دوور لە یەکدی دەمێننەوە، وەك چۆن لە شریتێکی سینەماییدا دەی بینین، چ پێوەندییەك کۆیان ناکاتەوە. رەنگە ئەم کەلێنە ترسناکە بێدەنگانەی کە وێنەو دەستەواژەکان لێك دابڕێ و وایان لێ دەکات وەکو خەڵقەندەی رووت لەبەر سەرمای زستاندا هەڵبلەرزن، ئەو هۆیە بێ کە ئێمە لە کاتی خوێندنەوەی ئەم رۆمانەدا وا لێبکات هەست بە تەنیاییەکی قوڵی راماڵەر بکەین. مرسۆ خۆی بۆ ئەزموونی خاڵیسە ساز دەدا، بۆ ئەو شادییەی ئێستاو لەحزەی راستەوخۆ دەی بەخشێت، وەك بڵێی مناڵێکی گەورەیەو بۆ یەکەمین جار چاو دەکاتەوەو پاکی و بێگەردی رووناکی دەبینێ و لە دڵەوە گەشکە بە ئاهەنگی رەنگەکان دەکات و بە دەم ژیانی هەموو بونەوەرانەوە "موجودات"

دەتریقێتەوە، تورِ دراوەتە عالەمێکەوە نایناسێت و بەوە حوکم دراوە کە لە کۆمەڵگایەکدا بژی کە لە زمانی تیٚ ناگەن، چارەنووسی بەستراوە بە خەڵکانێکەوە، بیرو بۆچوون و رەوشتیان شتێکی غەریبە، ناتوانیٚ و نایەویٚ هۆگری ببیٚ، وەکو غەریبیٚ لە نێو غەریباندا دەژی، ئەو بۆ ئێمەش ئێمەی کە دەیخوێنینەوەو شوێن پێی چارەنووسی هەڵدەگرین، ئینسانێکی غەریبە چ جێیەك لە سیستەمی ئامادەکراوی قییەم و رەوشتماندا نابینین کە بۆ ئەو گونجا بیٚ، ئێمە لە هەمانکاتدا هەست بە غوربەت و بێگەردی "برێ" ئەو دەکەین. بەڵام هەستێك، تورِەیی و ترس و بەزەیی تێدا تێکەڵ دەبیٚ، ئێمە نازانین لە ئاستی ئەم ئینسانە سەیرەدا کە لە هیچەوە دەست پێدەکات و ناشیەویٚ لێی لا بدا چی بکەین.

ئەلهەقی مرسۆ ئینسانێکی بێگەردە بە هەموو واتای وشەی بێگەردی. لوتکەی بێگەردی و تاوانەکەی لە هەمانکاتدا لەوەدایە کە ئەو تاکو ئێستا ژیانی خۆی گوزەراندووە بیٚ ئەوەی لەلایەن خۆیەوە گومان بخاتە دڵی ئینسانێکەوە، ئەو فیشەکەی لە دەمانچەکەی دەردەچیٚ بۆ ئەوەی کابرایەکی عەرەب بکوژیٚ چاوی خەڵکی لیٚ دەکاتەوە. ئەم تاوانەی کە رێکەوت، رێکەوتێکی کوێر کردی بەریشیەوە، بە رێژەی وەکیل نیابەوە ئەنجامە نەك سەرەتا. تیشکی خستە سەر ئەو ژیانەی تا ئێستا بە خەم ساردی و بیٚ موبالاتی گوزەراندوویەتی، ئەو جگەرەیەی کە بیٚ مەبەست لەبەردەم لاشەی راکشاوی دایکی، ئەو فرمێسکانەی بۆ ناشتنی دایکی نەیرِشت، ئەوچاو گەرم کردنە کەمەی، ئەو فیلمەی لەگەڵ ماری دۆستیدا دوای مردنی دایکی بە ماوەیەکی کەم بۆی چوو، هەموو ئەمانە دەبن بە تاوانێك کە کەس نایەویٚ پێی بەخشێت، کەواتە مرسۆ تاوانبارێکی هەرە گەورەی تاوان بوو، گوناحی هەرە گەورەشی ئەوەیە باوەرِی بە "گوناح" نەبووە یان لە واتای تێنەگەیی، بەرانبەر بە نەریت و خوی کۆمەڵگا بە خەم ساردی و گویٚ نەدانەوە دەوەستا، ئەو ئێستا لە روانگەی پرسکار "محقق" و "قازییەوە" "درِندەیەو دوژمنی مەسیحە".

مرسۆ وا سەیری مەسەلەکە دەکات وەکو ئەوەی ئینسانێکی دی موحاکەمە بکەن کە پێوەندی بەمەوە هەر نەبیٚ، هەست کردن بە بێهودەیی لە ناخیدا راکشاوەو، هەڵناسێت. هەر چەندە ئەم ئینسانە بە تەنیا بە رووی کۆمەڵگادا دەتەقیٚ، کە لە کەسێتی پرسکار و قازییەکاندا و شایەتەکان و قەشەی زیندانەکەدا و هەموو نەریتێکی رەوشتیدا خۆی دەنوێنیٚ، ئەم هەست کردن بە بێهودەییە لەلای ئەو ناگاتە قۆناغی هوشیاری، هەموو وشەیەك کە مرسۆ دەیدرکێنیٚ، لە هەستەوەو لە وێنەوە هەڵدەقولیٚ، کەچی هەر وشەیەك کە پرسکار دەیدرکێنیٚ دەلالەت لە مانایەك، یان شێوەیەك لە شێوەکانی سیستەمی شارستانی و کۆمەڵایەتی دەکات. بەم چەشنە مرسۆ بە غەریبی دەمێنێتەوە لە بەردەم خۆی و لە بەردەم ئەم کۆمەڵگایەی کە تاوانباری دەکات و بەرەو مل قرتاندنی رەوانە دەکات.

حوکمی خنکاندنی وەکو شمشێری جەلاد دەنگ دەداتەوە، قەشەی زیندانەکە سەردانی دەکات، ئەوسا کە مرسۆ هەستی بێهودەیی لەلا دەگاتە هوشیاری و رادەپەرِیٚ، لەو دەمەیدا کە مرسۆ پابەندە بە شادی ئەم دنیاوە، دەبینین قەشەکە بەڵێنی شادی ئەو دنیای دەداتیٚ، مرسۆ ئەم

هیوایە رەفز دەكات، لە قەشەكە رادەپەرێ و هاواری بەسەردا دەكات، هەموو ئەم مژدەیەی كە بە دڵنیاییەوە دەم دەیتێ، یەك تاڵ لە قژی ئافرەتێ ناهێنێ، یاخی بوونەكەی، ئەو یاخی بوونە نییە كە ئینسان بەناوی هەموو مرۆڤایەتییەوە بانگەواز و جاڕی بۆ دەدات، هەروەها بەناوی سروشتی مرۆڤایەتییەوە نییە، بەڵكو یاخی بوونە بەناوی شادی سەر ئەرزەوە كە تا ئەم كاتە بە بێ ئەوەی پێ بزانێ لەزەتی لێ وەرگرتووە، هەستم كرد، شاد بووم و هێشتاش هەر شادم" هەمان شادییە كە كامۆ لە وتاری (اعراس) دا باسی كردووە و هەڵقوڵاوی كلۆڵییەكی بێ بڕانەوەیە.
مرسۆلە هەموو ژیانیدا هەر بە تەنیا مایەوە، هەستی بە بوونی كەسانی تر نەكرد، تەنیا لەكاتی مەرگدا نەبێ، ئێستا بیر لە دایكی دەكاتەوە، ئەو دایكەی ئەمیان لەسەر تاوانبار كرد كە گوایە خۆشی نەویستووە، هەروەها بیر لە خەڵكی دەكاتەوە، ئەو خەڵكانەی لە نێویاندا دەمرێ. ئەمڕۆ هەموو ئاواتێكی ئەوەیە، بۆ ئەوەی هەستی تەنیایی كەم بێتەوە، لە رێگای چونیدا بۆ سێدارە زۆرترین ژمارە لە تەماشاكەران ببینێ كە بە هاواری رق و قین و كینەوە پێشوازی بكەن.

(٣)

نامۆ بریتییە لە دوو بەش، بەشی یەكەم بە كوشتنی كابرایەكی عەرەب لەسەر كەنارێك لە كەنارەكانی جەزائیردا كۆتایی پێدێ، بەشی دووەم بەوە كۆتایی دێ كە مرسۆ لە ئەنجامی ئەو كارەیدا بۆ مەقسەڵەكە دەبرێ، مرسۆ فەرمانبەرە لە یەكێك لە نووسینگەكانی جەزائیردا، دایكی لە كەترەخانەیەك دایە، بروسكەیەكی دەگاتێ و هەواڵی مەرگی دایكی تێدایە، دەست بە گێڕانەوەی چیرۆكەكەی دایكی دەكات، دوو رۆژ مادونی وەردەگرێ و دەچێ بۆكەترەخانەكە، بە درێژایی ئەو شەوە بە دیار تەرمەكەی دایكییەوە دادەنیشێ بۆ سبەینێ لەگەڵ بەرێ كردنی تەرمەكەی دایكیدا بۆ گۆرستان دەچێ، هیچ جۆرە خەمێك یان هەستێك نانوێنێ، تەنیا ئەوە نەبێ لە ئەنجامی گەرمادا هەست بە شەكەتی دەكات، لە كاتی دانیشتنندا دوو فینجان قاوە دەخواتەوە و جگەرەیەكی بەسەرا دەكات، ئەنجا چاوێ گەرم دەكات.
كە دەگەڕێتەوە بۆ جەزائیر، دەزانێ ئەو رۆژە شەممەیە واتە یەكەم پشوی كۆتایی هەفتەیە. دیارە ئەم رۆژە گرنگترین رۆژانی حەفتەیە، بۆ كەسانێ كە ژیانیان رۆتینە، دەچێ بۆ مەلە كردن، بە رێكەوت تووشی ماری دەبێ، ماری كیژێكە سەردەمێك لە هەمان دائیرەی مرسۆدا كاری كردووە، لە گەڵیدا دەچێ بۆ سینەما بۆ بینینی فیلمێكی هەزەلی، ئەوجا دەیباتەوە بۆ ماڵێ، دەست بەعەشق بازی دەكەن، رۆژی دوو شەممە وەكو جاری جاران بۆ سەركارەكەی دەگەڕێتەوە، ئەو ژینگەیەی چینی كرێكار دەبینین كە تێیدا دەژین، سیلیست ژنێكە و خاوەنی خوارنگایەكی بچووكە، خەریكی نان خواردنە سەلمانۆ پیرەمێردێكە بەتەنێ و لەگەڵ سەگێكی پیردا دەژی، لێی دەدا و جنێوی پێ دەدا، شەوێك لەسەر بانێژەكەی خۆیەوە كە بە تەنیشت ژوورەكەی مرسۆوەیە بۆ سەگە ون بووەكەی دەگەڕێ "ریمون"ش كابرایەكی رەوشت گومانا وییە دەڵێن گوایە، گەوادە.
لێ رێمون، هەستێكی ئابڕومەندانەی سەرەتایی تێدایە كە هەست دەكات دۆستە عەرەبەكەی خیانەتی لێدەكات، نەخشەی تۆڵەسەندنەوە دەكێشێت، یەكەم هەنگاوی ئەوە دەبێت داوا لە

مەرسۆ بکات کە بە زمانی ئەوەوە نامەیەك بۆ دۆستەکەی بنووسێت، ئەوجا بە شێوەیەکی دڕندانە دەکەوێتە وێزەی دۆستەکەی و ئەمە ئاشکرا دەبێت، داوا لە مرسۆ دەکات کە لە دادگا شایەتی بۆ بدات. مرسۆش رازی دەبێت.
لە پشووی کۆتایی حەفتەی سێیەمی دوای مردنی دایکی مرسۆ، ریمون مرسۆ و ماری دەعوەت دەکات کە رۆژێکی لەگەڵدا و لەگەڵ برادەرەکانی (ال ماسون) ببەنە سەر، کە دەست بە گشت و گەردش دەکەن، چەند عەرەبێك دوایان دەکەون، دەبێ بە شەڕیان، یەکێك لە عەرەبەکان چەقۆیەك لە ریمون دەدات و برینداری دەکات، مرسۆ ناوبژی کردن و دەمانچەکەی لە ریمون وەرگرت، عەرەبەکان کشانەوە، دوای فراڤینێکی بەلەزەت و خواردنەوەیەکی زۆر، مرسۆ بە کەنارەکەدا دەکەوێتە پیاسە و روو دەکاتە کانیەك، تاقە شوێنێك بوو کە لە کەنارەکەدا سێبەر دەیگرتەوە، لەو دەمەدا کە لە بەر تیشکی سووتێنەری هەتاودا هەنگاوی دەنا، یەکێك لە عەرەبەکانی بینی راکشاوە و شا بە سەپان ناگرێ. بە هەرحاڵ هەڵدەکێشێتە دەمانچە و چوار گوللەی بانەو بان یەك بە کابرای عارەبەوە دەنێ و گیانی لەبەر دەبرێ.
بەشی دووەمی سەرگوزشتەی مرسۆ بە دەوری ئەو "١١" مانگەدا دەسوڕێتەوە کە لە زینداندا بەسەری دەبات، چونیەتی موحاکەمە کردنی حوکمی ئیعدام، رۆژانی پێش جێبەجێ کردنی حوکمی ئیعدام، ئەو ماوە دوور و درێژەی لە نێوان تاوان و موحاکەمە، تەنیا هەندێ جار حاکمی تەحقیق، موحامی، ماری و کاهینی زیندانەکە دەبینێ، مرسۆ بە هیچ جۆرێ نایەوێ بەرگری لە خۆی بکات.
بەشی دووەم جیاوازترە لە بەشی یەکەم، بەشی دووەم لە دوو ئاست دایە، ئاستی دەرەوە کە بە موحاکەمە کۆتایی دێ، ئاستی ناوەوە کە لە کۆتایی رۆمانەکەدا دەگاتە لوتکە، ئەوەش رووبەڕووبوونەوەی کاهینی زیندانەکەیە، لەو دەمەدا کە مرسۆ چاوەڕوانی رۆژ بوونەوەی رۆژی جێبەجێ کردنی حوکمی ئیعدامەکە دەکات.
رۆمانی نامۆی ئەلبێر کامۆ یەکێکە لەو کارە ئەدەبیانەی کە گەلێ گفتوگۆو وتوێژی بەردەوامی دروست کرد، بە هاوارێکی نائومێدانە بەرانبەر بە ژیان هاتە ژماردن، هەروەها وا ژمێردا کە بەرجەستە کردنێکی روانینی نەهیلستانەی ئەوتۆیە، کە ئینکاری گشت بەهایەك دەکات، ئەمە جگە لەوەی بە نیمچە مانیڤیستێك دەربارەی ئیغتیراب لە قەڵەم درا.
دیارە ئەوەش خەتەرێکە روو لە هەموو کارێکی هونەری دەکات، ئەگەر بە تۆبزی لە دەرەوە بەسەریا بسەپێنرێ گەلێ لێکدانەوەو دەرهاویشتەی بەسەردا بار دەکرێ، رەنگە لێکدانەوەو ئیفرازاتی جوان بێ، بەڵام کارەکە سڕ پۆ دەکات چونکە مۆڵەتی نادات لە ناوەوە تیشك بخاتە سەر خۆی و روونتر و جوانتر بنوێنێ.
کامۆ لە پێشەکی نامیلکەی (الظهر والوجة)دا ١٩٥٧ دەڵێ: (تەنانەت ساتەکانی یاخیبوونیشم، هەمیشە پرشنگدار بوون. زروف خستیە نێوان کوێرەوەری و هەتاوەوە، کوێرەوەری رێی نەدام دوای ئەو بۆچوونە بکەوم کە دەڵێ هەموو شتێ لە مێژوودا و لەسایەی هەتاودا چاکەو بەجێیە، هەتاویش فێری کردم کە مێژوو هەموو شتێ نییە، کە ژیان بگۆڕین بەڵێ، بەرزی بکەینەوە بۆ

**روناكی، بۆ خۆمان، بۆ گشت بەشەریەت بەڵێ، بەڵام كە عالەم بگۆڕین نەخێر، چونكە عالەمم كردووە بە خوا).**

**رەنگە بێ سوود نەبێ ئەگەر قسەكانمان پتر روون بكەینەوە، ئەو گۆڕینی ژیانەی كە كامۆ باسی دەكات، ئامانجی بەرزو بەشكۆی هونەرە لای رامبۆی شاعیر، نزیكی نێوان ئەوو كامۆ هەر لە سنووری ئەم چەمك و تێگەیشتنی رۆڵی هونەرەدا نەوەستاوە، لەوە قوڵترە، رەگ و ریشەی لە زەمینەی ئەو هەستە هیلینیە نوێیە هاوبەشەی نێوانیاندا داكوتاوە، كە بە ئاشكرا بۆ وێنە لە چامەكەی رامبۆ (الشمس و الجسد) و لە (اعراس)ی كامۆدا دەدوێ، كامۆ گۆڕینی ژیان لە پارسەنگ و بەرامبەر بە گۆڕینی عالەم دادەنێ و دەڵێ (عالەمم كردووە بە خوام) ئەگەر مەبەستمان بێ زیاتر لەو قسەیەی دوایی تێبگەین، ئەوا دەگەڕێینەوە بۆ پۆل ڤالیری كە تەنیا بە رێكەوت نییە، ڤالیری لە چامەی (**المقبرة البحرية**)داو كامۆ لە كارە بنەڕەتییەكەیدا (سگورە سیزیف) بە هەمان دێری پندار دەست پێ بكەن، كامۆ درێژە بە پێشەكییەكەی دەدات و دەڵێ (دەربارەی خودی ژیان دوای تێپەڕ بوونی ئەم هەموو ساڵە چ شتێكم نییە بیخەمە سەر ئەوەی لە (**الظهر والوجة**)دا گوتوومە، كەچ خۆشەویستییەكی ژیان نییە بەبێ وەڕس بوون لێی.**

**كە ئەو قسەیەم كرد. نەم دەزانی تا چ رادەیەك راستگۆیی تێدایە چونكە ساتە نا ئومێدییە راستەقینەكانم نەدەناسی وەك لەوە دوا ناسیم، ئەوەی هەموو شتێكی لەناخمدا وێران كرد تەنیا ئەو ئەلهاو ئارەزووە بێ پایانە بوو بۆ ژیان ئەوەی تا ئەمڕۆش هەستی پێدەكەم، ئەوەی تاریكترین لاپەڕەكانی (**الظهر والوجة**) لێی دوا، بریتییە لە ئەڵهایەكی بێ وێنە و ژەم بردەییەكی بێ سنوور بۆ ژیان بە خراپترین و چاكترین شتەوە).**

**ئەوجا دەبینین لە كۆتایی (الصیف فی الجزائر) و (اعراس) ١٩٣٨ دا دەڵێ: (چونكە ئەگەر هەڵە و خەتایەك هەبێ بكرێ دەرهەق بە ژیان، رەنگە ئەو هەڵەیە نائومێدی نەبێ لە ژیان بە ئەندازەی ئەوەی واز هێنان بێ لە ژیان بە ئومێدی ژیانێكی دی لە ئایندەدا.)**

**ئەمە روویەكی زۆر بایەخدارە بۆ چونە ناو فیكرو تێگەیشتنی هەڵوێستی كامۆ، هەر لە سەرەتاوە وازی لە غەیبیاتی مەسیح هێنا. لە ئەنجامدا غەیبیاتی سەر زەوی رەفز كرد. (ئینسانی یاخی ١٩٥١) هەڵوێستی یونانی دەربارەی ژیان پەسەند كردو تا رادەی پیرۆزی خۆشی ویست و قەدری زانی، (گالیلو كە راستیەكی زانستی گرنگی دۆزییەوە، زۆر بە ئاسانیش نوكولی لێ كرد، هەر كە بینی ژیانی لە خەتەردایە خۆی لێ بەری كرد. لە روانگەیەكی دیاری كراوەوە دەتوانرێ، بگوترێ زۆر چاكی كرد. چونكە ئەوە مەسەلەیەك نەبوو كە لە پێناویدا بێتە سووتاندن، زەوی بە دەوری رۆژدا بسووڕێتەوە یان رۆژ بە دەوری زەویدا بسووڕێتەوە. شتێكە هاوتای ژیان ناكاتەوە) سیزیف ١٩٤٣ كامۆ وەكو هیلینیە كۆنەكان، عالەم قبول دەكات، رەفزی ناكات، دژایەتی ناكات، خۆی لێ نادزێتەوە، بەڵكو بە خۆشەویستییەوە پێشوازی لێ دەكات، دەیكات بە (خوا) كامۆ مەلەكوتو مەملكەتی مەبەستەكان وەكو یەك رەفز دەكات، (مەلەكوت چ شتێك پێشكەش ناكات جگە لە دوورەپەرێزی و چاوپۆشی لە ژیان، كەواتە بێ كەڵكە وسوودێ ناگەیەنێ، مەملەكەتی مەبەستەكانیش جگە لە وێرانكاری چیدی پێشكەش ناكات كەواتە**

ئەویش بێ کەڵکە، بۆیە هەردووکیان وێڕای جیاوازی نێوانیان لە یەك شتدا یەك دەگرنەوە کە ئەویش ڕەفزی سوڵح کردنە لەگەڵ ژیانا، ئەو قیمەیەیە کە یاخی بوون پەردەی لەسەر هەڵدەماڵێ، کەواتە شتاقیان هیچمان پێشکەش ناکەن جگە لە دوو جۆرە نموونەی زۆر دوور لە واقیعەوە) ئینسانی یاخی. د. عبدالغفار مکاوی لە لێکۆڵینەوە جوانەکەیدا (ئەلبێر کامۆ، هەوڵدانێ بۆ لێکۆڵینەوەی فیکری فەلسەفی، بلاوەخانەی المعارف، القاهرە)دا دەڵێ: ئەو فیکرەی کە عەقڵ ڕزگار دەکات و دەیخاتە، جێگای متمانە و بڕوای تەواوەوە، کامۆ نێوی دەنێ (فکر الظهیرة) نموونەی باڵای ئەو بریتییە لە فیکری یۆنانی کە هەمیشە پەیامداری تەسەوری حەدە، پەڕگیری لە هیچ شتێکدا نەکردووە، نە لە پیرۆزی نە لە عەقل، ئەو فیکرەی توانی پارێزگاری نێوان سێبەر و ڕووناکی بکات و پایەی مرۆڤ لە سروشت و غەیب و لە بارەگای خواکاندا دیاری بکات، بریتییە لە فیکری سنوور و پێوانە (الحد والمقیاس) ئەوەش فیکری یەکێتییەکی ئەوتۆیە کە چ شتێکی دەربارەی کەڵکەڵەی شمولیەت نەناسیوە، کە ئەوڕۆ هەڕەشە لە کوشتنی ئەوروپا دەکات، کامۆ گوتەنی، ئەوجا د. مەکاوی دەگەڕێتەوە سەر باسەکەی و دەڵێ (فیکری ظهیرە ی یۆنانی لەلای ئەلبێر کامۆ فیکری نیوەی شەوی ئەوروپا دەگەیەنێ کە بەوپەڕی خێراییەوە بەرەو داگیرکردنی شمول دەچێت و بێ وچان سنوورەکان دەبەزێنێ تا خۆی بخاتە گێژاوی سەرکێشی و ملهوری بێ سنوورەوە.) لەپاڵ ئەو هەستەدا بە نرخی ژیان، هەستی تامەزرۆیی ژیان ئەو تامەزرۆییەی کە هەرگیز لە جۆش و خرۆش ناکەوێ، هەستی بێ هودەییش لەلای کامۆ دەبینین، ئەو هەستەی وای لە کامۆ کرد لە سەرەتای سیزیفدا بڕیاری ئەوە بدا کە یەك مەسەلەی فەلسەفی هەیە و لە ڕاستیدا خەتەرە، مەسەلەی خۆکوژی (حوکم دان لەسەر ئەوەی ئاخۆ ژیان ئەوە دێنێت یان ناهێنێ کە بژیت، ئەوە مەبەستی گەوهەری فەلسەفەکەیە)

شان بە شانی مەسەلەی خۆکوژی، هیواو ئومێد دەبینین. (سندوقی باندورا کە گشت بەلاو نەهامەتیەکی ئینسانی تێدا کۆبۆتەوە، یۆنانیەکان لە ئەنجاما هیواو ئومێدیان لێ دەرهێنا، دوای گشت خراپەکارییەکانی دی، بەو حیسابەی لە هەموویان خراپترە. لە ڕاستیدا من چ شتێ نابینم لەم ڕەمزو هیمایە کاریگەتر بێ لە دەرونا، چونکە ئومێد بە پێچەوانەی باوەڕی باوەوە، بەرانبەر بە تەسلیم بوونە (الصیف فی الجزائر) بە ڕادەی ئەوەی کە کامۆ خۆکوژی جەستەیی ڕەفز دەکات. خۆکوژی میتافیزیکیش ڕەفز دەکات. هیوا، خۆکوژی، سووکایەتی پێ کردنی بوونە، نکۆڵی کردنە لە بوون، لە سیزیفدا دەپرسێ (ئاخۆ بێ هودەیی بوون، ناچارت دەکا لە ڕێگای هیوا یان خۆکوژییەوە لێی هەڵێی؟) هەڵبەت وەڵام لە گشت بیرکردنەوەیدا....نە ئە، ئەدی چار – ئەگەر چارێك هەبێ بۆ ڕووبەڕووبوونەی بێ هودەیش ئەوا خۆکوژی نییە، خۆ دۆزینەوە لە عالەمدا نییە هەروەها چاوەڕوان کردنی عالەمێکی دی نییە کە کەڕ وناماقۆڵ نەبێ. چار لە بەزاندنی سنووری خودی بێ هودەییەکەدایە، بەزاندنی سنووری ڕاکردن و هەڵاتن لە بێ هودەییە یاخۆ هەڵخەڵەتاندنی ئینسان خۆیەتی، بەڵکو هەنگاونانە بەرەو ناوجەرگەیان، بەرەنگاربوونەوەی ژیانە بەوەی تێکەڵی ببێ و ئالکاوی ببێ و بیدۆزێتەوەو تێیدا بژیت (ئینسان لە سایەی هەست کردن بە بێ هودەییدا لە ژانەکان ورد دەبێتەوە، بتەکان کەڕ دەکات ئەوسا کە

زەوی لە کەونیدا، کە لە پڕ ناچاری بێدەنگی کراوە، لە ڕێگای هەزاران دەنگی بچکۆلەی ئاوێتەی دڵبەندییەوە دێتە زمان و گۆ. چ هەتاوێ بێ سێبەر نییەو پێویستە شەو بناسین. (سیزیف). ئینسانێك کە هەست بەبێ هودەیی بکات دەتوانێ بە هیواوە سەرقاڵ بێ، ئەگەر هیوا هەبێ – نابێ لە راستیدا– ئەوەندە سەرقاڵی بکات، بە ئەندازەی ئەوەی کە پێویستە دەستبەرداری هەڵاتن و خۆهەڵخەڵەتاندن بێ. (هەمان سەرچاوە). تێکەڵ بوون و چوونە ناو ژیان لە بەرامبەر بێ هودەییدا، لەلای کامۆ یاخی بوونی بێوچان دەگەیەنێ، یاخی بوون بەواتای رەفز کردنی ناماقوڵیەتی عالەم، چاو نەپۆشین و خۆ نەدزینەوە لە عالەم.

دیارە ئەم نوێشە کورتە، مۆڵەتی ئەوە نادات تەواوی هەڵوێستەکانی کامۆ بخرێتە روو. یان دەرفەتی ئەوە نادات هەموو ئەو ڕێگایانە، شی بکرێنەوە کە بیری کامۆ پێیدا تێپەڕیوە، لێرەدا مەبەستمان گەڵاڵەکردنی پوختەیەکە کە رووناکی داخلی بخاتە سەر عالەمی چیرۆکی نامۆ، وتمان ژیان بۆ خۆی لە خۆیدا، قیمەوبەهای هەوەڵ و ئاخیرە لەلای کامۆ چ بەهاو قیمەیێکی دی لەو بەرزتر نییە، دیارە لە بەرامبەر ئەم قیمەتە بەرزەشدا حەتمیەتی مەرگو بێ هودەیی بوون هەیە. لە نێوان ژیانو مەرگیشدا رەفزی تەنازولو خۆ کوژی هەیە، رەفزی هەڵاتنو خۆ هەلخەڵەتاندن هەیە، هەوڵی یاخی بوونێکی بێ بڕانەوەیە، تاقە ڕێگایە بۆ بەزاندنی سنووری بێ هودەییو تێکەڵ بوون بە ژیان. هەروەها گەڕانە بە دوای هوشیاریو وەعیدا. وەعی بەبوون، لە راستیدا ئەم هەست و وەعیە لەو بازنە داخراوەدا –بمانەوێ و نەمانەوێ– هەست کردنە بەبێ هودەیی، بە بێ کەڵکی هەموو جۆرە کارێ، بەپوچیو بێ مانایی هەموو هەوڵێك، (هەستان، ترام، چوار سەعات کارکردن، خەوتن، دووشەمە، سێ شەممە، چوارشەممە، پێنج شەممە، هەینی، شەممە. هتد. ئەمە ڕێگایەکە هەمیشە ناگیرێتەبەر، چونکە زۆر نابات پرسیارێك لە دەروونا قوت دەبێتەوە، بۆچی، ئەو کاتە هێز بێ بەش دەبێ لەو وەنەوزە پێویستەی بەردەوام بوونی ژیان) نامۆ.

لێ ئەو هەستە بۆ خۆی، ئەو وەئاگاییە سەختە، ئەو رووبەڕووبوونەوە بێ پەردەیەی بوون لە ناو جەرگەی بێ هودەییەوە تاقە رزگاربوونێکی لەبارە، رزگاربوونی چیی؟ رزگاربوونی رۆح وەك (باوکە بانیلو) لە (رشانەوەدا) دەیڵێ؟ نەخێر، رزگاربوونی جەستەکانە وەك کامۆ بە زمانی (دکتۆر ریو)وە لە هەمان بەرهەمدا دەیڵێ، ئەوە رزگار بوونێکە لە لای کامۆ چ ڕێگایەکی بۆ نییە، جگە لە ڕێگای هەستەکان نەبێ.

کامۆ لە چیرۆکی نامۆدا –لە شەخسیەتی مرسۆدا– بوونەوەرێکی حسی خالیسە پێشکەش دەکات. ژیان لە لای بریتییە لە تێرکردنێکی جەستەیی بەردەوام، بە رادەیەك وای لێدەکات بە ئاشکراو بەو سادەییەی کە لە ئەنجامدا بەرەو مەقسەڵەی برد بە ئەوقاتەکەی بڵێ کە (پێویستییە جەستەییەکانی زۆر جار زاڵ دەبێ بەسەر هەستەکانیا و دەیشێوێنێ) و ئەو رۆژەی کە دایکی نێژرا (ماندوو بوو، بەرادەی پێویست دەرفەتی نووستنی بۆ نەڕەخسا.)

کامۆ لەمەڕ ئەو پاڵەوانەی، گوتویەتی (ئینسانێکی بەستەزمانی رووتە، ئینسانێکە، خەڵکی ظهره یه) ئەگەر بیرمان بێتەوە ئەم بت پەرستە، ژیا، حوکم دراو لە رژێمێکی ئەوروپایی

مەسیحی دا کوژرا. بە گوێرەی فیکری کامۆ هەڵقوڵاوی نیوە شەوە، هەڵبەت ئەوەش دەزانین کە بۆ وەك بەستەزمانێ دەیبینێ، بۆچی وەك خۆی نێوی ناوە بێگانەیە، دیارە ئەمە فێلێکی رۆماننووسی نییە کە هەتاو ئەو رۆلە گرنگە لە رۆمانی نامۆدا ببینێ، مرسۆ لەو دەمەدا پیاوی کوشت کە لە ژێر کاتێکردنی هەتاودا بوو، ئەمەشی بۆ هەموو ئەوانە دووبارە دەکردەوە کە پرسیاریان لەمەڕ هۆی تاوانەکەی کردبا واتە ئەمەی لە کەس نەدەشاردەوە! هەتاو سەرە گێشکەی پێ خست، کەوتە ورێنە کردن، پەنجەی بە پەلەپیتکەوە ناو ئینسانێکی دی کوشت، وەك ئەوەی رەوتی کارەکە ئەوە بڵێ کە مرسۆش نێچیرێکە، وەکو نێچێرەکەی خۆی، چونکە خەڵکی شارستانیەتێکی ناکۆك و نامۆ و قەرزاربارە ئەمە دەلاقەیەکە کە دەتوانرێ لێوەی بڕواندرێتە شەخسیەتی مرسۆ، دەلاقەکەی دی ئەوەیە کە سارتەر ئیشارەتی بۆ کردووە، مرسۆ حیکایەتەکەی بەرجەستە کردنێکی رۆمانی بێ هودەییە. مرسۆ لە دەلاقەی یەکەمەوە، وەکو خەڵقەندەیەك لە چوارچێوەی ئەو شارستانیەتەدا دەسوڕێتەوە، کە فیکری یۆنانی تێدا لە دایك بوو، کە کامۆ و هەموو کامۆ ئاساکان هەوڵیاندا سەر لە نوێ زیندووی بکەنەوە، بۆیە ئینسانێکی بت پەرست و لە سایەی شارستانیەتێکی نامۆی لە دەرەوە هێنراودا دەژی، شارستانیەتێك کە لە ساتی مێژوویی کارەساتەکەیدا زاڵ و باوە، بۆیە وەکو نامۆ و بێگانەیەك دەژی، رەفز دەکرێ، قەرزاربار دەکرێ، دەکوژرێ، چونکە بێگانەیە.

لە دەلاقەی دووەمەوە کە سارتەر وەری دەگرێ و بۆ لێکدانەوەی بە هەرمەکە لە سەری دەوەستێ سوورە لەسەری –خەلقەندەیەکی عەبەسییە– گەرچی تەنیا لەو ساتەدا هەست بە بێ هودەیی دەکا، کە لە زیندانەکەیدا رووبەڕووی مەرگ دەبێتەوە.

بەرهەمەکە، وێڕای ئەمەو ئەوە، بەرجەستەکردنی روانینێکی یەجگار قوڵ و بە ئازارە بۆ روویەك لە رووەکانی بێ هودەیی ژیان، کە دەقاو دەق رووی پەیوەندی تاکە بە خەڵکەوە و رادەی خەتەری بە رێژەی تاکەوە، هەر لەبەر ئەوەی ئەو تەنیا باڵە و ئەوان زۆرن. ئەوە روویەکە دەمانگەیەنێتە زەمینەیەك کە زۆر جار کامۆ رووی تێدەکات، سەرقاڵیەکی بنەڕەتی بۆ پێك دێنێت، گیروگرفتی عەدالەت وا بزانین پێویست بەوە ناکات بڵێین کاری گەورەی هونەری وەك کارەکانی ئەم نووسەرە، دەجولێ و دەژی و گەواهی خۆی لە دەلاقەیەك زیاترەوە دەدات، قوڵی و چاکی و گشتیەتی خۆی لەم فرە لایەنیەوە وەردەگرێ، لە دەوڵەمەندی بە پیتی جیهانی ناوەوەی وەردەگرێ.

رەنگە خراپ نەبێ لەلایەکی ترەوە ئەوە بڵێین کە بابەتی نامۆ لەو کارانەی کامۆ کە لە پاڵ سێ بەرهەمی تری دا ئەگەر ئەم دەربڕینە دروست بێت –نووسەر بیرو توانای داهێنانی خۆی تێدا خستە کار بۆ شیتەڵکردنەوەی ئەوەی کە لە پێشەکی سیزیفدا ناوی لێ نا (ئەو هەستی بێ هودەییەی کە مرۆڤ دەبینێ لەم سەدە باو وبلاوەدا) بۆ ئەمەش رێگای جودای شێوەی ئەدەبی و شێوازی چارەکردنی گرتە بەر (نامۆ ١٩٤٢، ئوستورەی سیزیف ١٩٤٣، بەدحاڵیبون ١٩٤٤، کالی گولا ١٩٤٥، لە راستیدا چ رێگایەك نییە بۆ تەماشاکردنی بەهەرمێك لەم بەرهەمانە، بێ

سیانەکەی دی، ئاخۆ ئەمە ڕێکەوتە، کە مرسۆ لە زیندانەکەیدا چاوی بە پارچە ڕۆژنامەیەکی دڕاو بکەویۆ ببیٚ بە هەوێنی کارەساتێکی بیٚ هودەیی لە شانۆگەری (بەدحاڵیبون)دا؟
شایەنی باسە ئەوەش بڵێین کە کامۆ لە پالٚ ئەوەدا کە یەکجار سەرقاڵی چەمکی عەدالەت بوو، وەك زۆربەی ڕۆشنبیرانی سەردەمەکەشی قینێکی یەکجار زۆری لە سزای خنکاندن بوو، کامۆ هونەرمەندێکی مەزن بوو، تیورسینێکی گەورە بوو، پیشە وردەکەشی خستە خزمەت بیرەکانییەوەو توانایەکی چاکی لە بەکارهێنانی چەکی تەوس‌و توانجدا خستەکار... دەبا ئێستاش لە دیوی ناوەوە بڕوانینە بەرهەمەکانی، مرسۆ کێیە؟ یا بە شێوەیەکی تر بڵێین مرسۆ چییە؟ ئەو شەخسیەتە لە کارەکەدا دەژی، دەجولیٚ، کار دەکات و وەکو هەر ئینسانێکی ئاسایی توانایەکی هەیە، هەست دەکات زیاد یان کەم، هەستێکی جەستەیی جیای دەکاتەوە بیٚ ئەوەی دای بڕیٚ یان جیای بکاتەوە یان شازی بکات، هەستێکی جەستەیی بەهێز کە هەمیشە عەودالی دوای تێر بوونە، مرسۆ دلیٚ (ویستم ئەوەی بۆ بسەلمێنم کە تەواو وەکو هەموو خەلکی دیم، چ جیاوازییەکم لەوان نییە، بەلاٚم سەیرم کرد ئەمە سودێکی ئەوتۆی نییە، لەبەر تەمەلی وازم لێهێنا) ئەوجا دەلیٚ (لێی پرسیم ئایا من دایکم خۆش ویستووە، گوتم بەلیٚ وەك گشت خەلکانیٚ) لە کۆتاییدا بەسەرسامیەوە دەلیٚ (نەم دەتوانی تێبەگەم کە چۆن کرا خەسلەتی ئاسایی مرۆڤ ئەو خەسلەتانەی لەهی خەلکانی دی جیاواز نییە، هەلبگەڕێندرێتەوە و ببیٚ بە تۆمەتی کوشندەو بەلگەی تاوانبارکردن.)
ئەمە بەرەو لایەنەکەی دی مرسۆمان دەبات، ئەو کەسێکی دییە، بەلاٚم دیسانەوە –لەوەشدا وەکو هەموو خەلکێکی دی– تاقە کەسێکەو خەلکانێکی زۆر تێی ئالاٚون، گەلیٚ کۆسپی لە ڕێگادایە، پێوانە و پێوەر، گەلێك داوای کۆمەلاٚیەتی کە پێویستە لە تاکا هەبن بۆ ئەوەی ڕێگای ژیانی پیٚ بدریٚ، هەموو ئەمانە شێوەی داڕشتنی مەحکەمیان وەرگرتووە، بوون بە دروشم و نەریت، لە ڕێگای خۆیانەوە بوونەوەرە ئینسانێکان دادەڕێژن و لە قالبیان دەدەن، لە سەرجەمی ئەوانەوە ڕژێمێکی نا شەخسی ئەوتۆ دروست دەکەن کە بتوانیٚ لە هەر کاتێکدا دەستی دەستەلاٚتدارێتی خۆی بە ئاسانی بۆ هەر تاکیٚ بەریۆ لەت و پەتی بکا، ملی ژێوە بکات، وەك ئەوەی لەگەلٚ مرسۆدا کرا.
جارێکی دی ئیشارەت بۆ قۆناغەکانی کاملٚ بوونی داهێنانی کامۆ دەکەین، لەسەردەمی گەنجیدا بە گەشانەوەی فیکری هیلینی کە بە درێژایی ژیان لەلای نەکوژایەوە، دەستی پێکرد (الظهر و الوجة) و (اعراس) ئەوجا قۆناغی هەست کردن بە بێهودەیی، دوای ئەمە قۆناغی یاخی بوون، ئەم قۆناغە بە (ڕشانەوە) ١٩٤٧ دەستی پێکرد، دوای ئەوە (حالە حصار) ١٩٤٨، (العادلون) ١٩٤٩، دواجار (ئینسانی یاخی) ١٩٥١.
لە سەرەتای قۆناخی یاخیگەریدا (ڕشانەوە) کامۆ دەگەڕێتەوە سەر گیروگرفتەکەی مرسۆی پالەوانی چیرۆکی نامۆ، (عرافە) کە لە بەردەم جران و کوتاردا دەلیٚ (وەللاٚیی ئەگەر گشت ئەم ئۆباشانە بخرێنە زیندانەوە ئیدی پیاو ماقولاٚن دەتوانن بە ڕەحەتی و ئاسودەیی بژین). مەبەستی ئەم شەخسیەتە وردە بورجوازیە ئاشکرایە، خەلکانی ماقولٚ دژ بە ئۆباشەکانن. ڕەفز

کردنی لایە جیاوازەکەی دی، تاوانبارکردنی. تەنانەت لە بواری رشانەوەشدا دەرفەتی پیاو ماقۆڵ یان ئوباش نادات هەناسە بدەن. کامۆ وەك ئەوەی هێشتا نیگەرانی تاوانبارکردنی مرسۆ بێ لەلایەن پیاو ماقولأنەوە، بۆیە بەم شێوە تەوس ئامێز و پڕ لە سەرسامیە دەگەڕێتەوە سەری.
بێگومان مرسۆ تەنیا، مرسۆی کائینی ئینسانی، ئەو مرسۆیە نییە کە مەکینەی رژێمی ناشەخسی خستی. مرسۆ ئەوسا کە وەك یەکێکی نوقسان، عەیبدار و جیاواز لە سیستەمی شێوەی پیاو ماقولأن و ئارەزووەکانیان بینراوە، چی؟ کەسێ لە مەرگی دایکیدا ناگری؟ بەو تۆمەتە حوکم درا، تاوانبار کرا و لە سێدارەدرا، بۆ ئەوەی ژیانی بکەوێتە قەبێڵی جیاوازی ئەم سیستەمو شێوەیە کە دەبوو وابێ، لە سێدارە درا وەك ئەو کەڵو پەلە عەیبدارەی خەسڵەتی چاکی تێدا نییەو نێوی کارخانەکەی پێ دەزڕێ. بێگومان مرسۆ لەسەر ئەوە محاکەمەو ئیعدام نەکرا (تەوس‌و توانجی کامۆ ئا لێرەدایە) کە ئینسانێکی دی کوشت، بەڵکو زیاتر لەسەر ئەوە محاکەمەو ئیعدام کرا کە بە پێی داب‌و دەستوری پیاو ماقولأن، کۆمەڵگە، رەفتاری نەکرد.
هەموو نرخێکی تاوانە راستەقینەکەی ئەوەیە، کە رێگای خۆش کرد بۆ ئەوەی دادگای بۆ دابنرێ‌و دەستی لێ بوەشێنرێ، نەك لەبەر ئەوەی پیاوکوژە، بەڵکو لەبەر ئەوەی (هەست سزە، یاخییە، دوژمنی مەسیحە) کامۆ رەفزی هەڵوێستی پیاو ماقولأن دەکات، بەرهەمەکە بە خۆ هاوار دەکات، ئەگەر مرسۆ لەبری جگەرەکێشان‌و قاوە خواردنەوە، بەسەر تەرمی دایکیدا بگریایە، ئەگەر لە کاتی ناشتنیدا وەك پێویست بوو بکرێ، دەستی بەگریان کردبا، ئەگەر راستەوخۆ لەگەڵ دۆستەکەیدا بۆ سینەما نەچووایە، ئەگەر ئەمەو ئەوەی نەکردبا، سەرباری هەموو ئەمانەش ئەگەر راستگۆ نەبایە نەدەچووە پای قەنارە، چ عەیبێکی نەدەبوو، لەلایەن کۆمەڵگای پیاو ماقولأنەوە، وەکو بێگانەیەك تەماشا نەدەکراو دەرخواردی مەرگ نەدەدرا.
هەست کردنی کامۆ بەو جیاوازییە پوچەڵە، کاژە خەمێکەو بەسەر لوتکەی بەرهەمەکەوە دیارە، لەلایەکەوە مژولی پابەندی سەرقاڵییە ئەخلاقییەکەی یەکەمیەتی، بابەتی عەدالەت، لەلایەکی دیکەوە لایەنێکە لە لایەنە ماندووەکانی بێ هودەیی، لێ تەنیا کامۆ هەستی پێ ناکات،
مرسۆش هەستی پێ دەکات‌و ئێمەش لەگەڵیا هەستی پێ دەکەین، سۆزمان بۆی دەجولێ، بێ ئەوەی بە خۆمان بزانین لە تەکیا دەوەستین، نووسەر بە زەبری پیشەکەی‌و لە رێگای بەکارهێنانی زمانەوە توانی بمانخاتە هەڵوێستێکی ئەوتۆوە، کە لایەن‌و تای پاڵەوانەکەی بگرین، وای لێ کردین روانین‌و بۆچوونی ئەو پاڵەوانە وەك مەسەلەیەکی سەلماو وەربگرین، لەگەڵیدا یەك دەکەوین کە تاوانبار نییە، وێرای ئەوەی خەڵکانی دی تاوانباریان کردووە –کە لەرووی یاساوە شیاوە– ئەوەی سەیرە، ئەو خۆی قینیان لێ هەڵناگرێ بەلأم ئێمە –وەك خوێنەر قینیان لێ هەڵدەگرین و بە پیاوکوژیان دەژمێرین.
وێرای ئەمەش هەر ئەو مرسۆیەی کە ئێمە بەزەییمان پێدا دێتەوە، گومان لە بکوژی ناکرێ، ژیانی زەلامێکی دی سڕیەوە، کە ئەو مافەی نییە، لە راستیدا کە حوکم درا لە سەر تاوانێکی ئالۆزو نادیار حوکم درا، (چونکە هەست سزو دوژمنی مەسیحە) ئاسایی بوو تاوانەکەی لە بیر بکات و بپرسێت جا ئەوان حەقیان چیە کە من لەسەر گۆڕی دایکم نەگریابم؟ ئەو –لە ناخی

خۆیدا– هەست بە تاوانی کوشتن ناکات، ئەو تاوانە راستەقینەیەی کە کردی، بەلاّم گشت ئەمانە ئەوە ناگەیەنن کە پیاوکوژ نییە، ئەی چۆن ئێمەی خوێنەر هاوسۆزی لەگەڵدا بکەین، تاوانەکەی ئەو فەرامۆش بکەین و قازیەکانی تاوانبار بکەین؟

ئەوە پیشەکەی کامۆیەو لە پشت پەردەی پیشە بە برشتەکەیەوە روانگە ئینسانیە– ئەخلاقیەکەی راماندەکێشێتە پالّ خۆی، لە رێگای تەوس و توانجەوە، لە رێگای تاوانبارکردنی رەواوە بە تەواوی وەعزەکەی هەلّگێرایەوە، تێکڕای مەکینەی رژێمی کۆمەلاّیەتی گۆڕی و بە شێوەیێ تاوانباری کرد کە تاوانی پالّەوانەکەی لە بیرمان بردەوەو چوینە پالّ پیاو کوژەکەو قازیەکانمان تاوانبار کرد.

بۆچی؟و چۆن؟ چونکە چەمکی عەدالەت هەموو –لەو چوارچێوەیەدا– دوای ئەوەی قازییەکان بەو شێوەیە بەکاریان هێنا، لە گشت پاکانەیەکی ئەخلاقی رووت بووەوە. بەلاّم چونکە کامۆ رێگایەکی ئاسایی بەکار هێنا، بە ئەسپایی پالّی پێوەناین و خستینیە دەرەوەی سنووری ئەو بیرکردنەوەیەی کە پێی راهاتبووین، کەمێ جولاّندینی و وای لێ کردین لە دوورەوە شتەکان ببینین و حوکمی بەسەرا بدەین لە بری ئەوەی خۆمانی تێ فرە بدەین و رامان بمالّێ، روجیە کویلیو لە کتێبی (البحر و السجون)دا دەلّێ ئامانجی سەرەکی کامۆ لە چیرۆکی نامۆدا ئەوە بوو شەخسیەتێ دروست بکات کە خۆی لە چوارچێوەو ناوجەرگەی هەندێ هەلّوێستدا ببینێتەوەوئەوە رەفز بکات کە روو بە رووی ئەو هەلّوێستانە نەبێتەوە. بەلّێ مرسۆی ئاشنامان پیاو کوژە، عەدالەتی بەشەر تاوانباری کرد، لێ روونە کە ئەو رووداوە تەنیا بۆنەیەکە و رێ بۆ نووسەر خۆش دەکات کە مەبەستە سەرەکییەکەی ئەنجام بدات، عەدالەت بخاتە قەفەزی تاوانبارییەوەو لە پالّ ئەودا هەموو کۆمەلّ بخاتە قەفەزی تاوانبارییەوە، بەو چەشنە هەولّی نووسەر بۆ ئەوە بوو کە نامۆکەی بکات بە ئینسانێکی ئاسایی وەك ئێمە. تەبا بین لەگەلّیا، لە تەکیا بوەستین، ئەوسا کە ئەو نامۆ و بێگانە نابێت بەلّکو بە روانینی کامۆ کۆمەلّ بێگانە دەبێ، کۆمەلّی (نیوە شەو) کە بە بێگانەی دەزانێ لە نێو ژیاندا.

کامۆ لە (الظهرو الوجة)دا دەلێ عالەم مانای قولّی خۆی بە دەستەوە نادات تەنیا بەخستنە رووی رادەی (سادەییە بێ هودەکەی) نەبێ، مرسۆ کە لە مەقسەلّەکە نزیك دەبێتەوە (...گشت شتێ زۆر سادەو ئاساییە) (ئەوەی ئێستا بەلامەوە مەبەستە راکردنە لە مەکینەکە، رۆژنامەکان هەمیشە باسی قەرزێ دەکەن کە دەبێ بدرێتەوە بە کۆمەلّ، لێ ئەوەی ئێستا کە مەبەستە، ئەوەیە بتوانم هەلّێم، قەلّەم بازێ بۆ دەرەوەی دابو دەستورێ بدەم کە دانامرکێتەوە ئەوجا راکردنی شێتانە، لەوانەیە هیوای ئەوە هەبێ مرۆڤ لە کاتی راکردندا بالّندەیەك بە فیشەکێ لە ئاسمانەوە بخاتە خوارێ. بەلاّم من ئەو لەزەتە لە کوێ بێنم، مەکینە گەمارۆم دەدات و زۆر بە ئاسانی دەستم بەسەردا دەگرێ، مرۆڤ هێندە بە ئاسانی لە مەقسەلّە نزیك دەبێتەوە وەك ئەوە وایە بۆ پێشوازی یەکێکی دی بچێت، بەبێ دەنگی دەکوژرێ، بە شەرمەزاریەکی کەمەوەو بە شانازییەکی زۆرەوە، مەکینە خۆی هەموو شتێ دەستەبەر دەکا و گشت شتێ هەلّدەلوشێ).

ئەمە لە روانینی کامۆوە دوو جاران بێ هودەییە، بێ هودەیی بوون لە کەوندا کە تێیدا دادەنرێین بۆ ئەوەی بمرین،و بێ هودەیی ژیان لەو دەمانەدا کە دەمی لە دایك بوون لە دەمی مەرگ جیا دەکاتەوە.. بەم شێوەیە بوونو ژیان تاقە رێگایە بۆ بەزاندنی سنووری هیواو خۆکوژی.. ئەوەیە کارەساتی ئەبسێردیەتو ئەولاتریش لە گیروگرفتەکەی مرسۆدا، رەنگە هەست کردنی پڕ لە ژان بەم کێشەیە وای لە کامۆ کردبێ کە بڵێ لە (نێوان بەڵێ و نە)دا، .. نەك ئومێد و هیوای رۆژانی چاکتر، بەڵکو بێ موبالاتیەکی بێگەردی سەرەتایی بەرامبەر هەر شتێك هەیە، بەرامبەر خۆم. بەڵێ، هەموو شتێك سادەو ئاسانە، خەڵکی شتەکان ئاڵۆز دەکەن، بۆ وێنە کە یەکێ حوکمی ئیعدامی بەسەردا دەدرێ، خەڵکی چ پێویستیان بەوەیە بڵێن بۆیە دەکوژرێ، تا قەرزی کۆمەڵ بداتەوە؟ ئایا ئەوەندە بەس نییە بڵێن لەسەری دەدرێ؟

تێبینی
بڕوانە گۆڤاری گزنگ، لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردستان، ژمارە: ٥ و ٩

# میوان

**چیرۆکی: ئەلبێر کامۆ**

مامۆستا، دەیڕوانییە ئەو دوو زەلامەی کە بە هەورازەکەدا بەرەو لای ئەو هەڵدەگەڕان. یەکێکیان ئەسپ سوارو ئەوی تریان پیادە بوو: هێشتا بە تەواوی نەگەیی بوونە سەر ئەو ڕێگە سەختەی بەرەو قوتابخانەکە دەهات. بە نێو تاشە بەردانداو بەنێو ئەو بەفرەی کە تا چاو بڕ دەکات، ئەو هەڵەتە چۆڵ و هۆڵەی داپۆشی بوو، هیلاك و ماندوو دەهاتنە پێشێ. ئەسپەکە ناو بەناو ساتمەی دەدا.. مامۆستا بێ ئەوەی گوێی لەچ شتێك بێ، هەڵمی هەناسەی ئەسپەکەی لە دوورەوە دەبینی. پێ دەچوو بەلای کەمەوە یەکێك لەو دوو ڕێبوارە شارەزای ناوچەکە بێ. چونکە بە هەمان ڕێگەدا دەهاتن کە چەند ڕۆژێك بوو چینە بەفرێکی ئەستوور داپیۆشی بوو. مامۆستا لە دڵی خۆیدا حیسابی کرد کە بە نیو سەعاتی دی ئەوجا دەگەنە سەر گردەکە.

دنیا سارد بوو، خۆی بە قوتابخانەکەدا کرد تا چاکەتێك لەبەر بکات. بەنێو پۆلە چۆڵ و ساردەکەدا ڕەت بوو. ئەو چوار روبارەی فەرەنسا کە بە چوار ڕەنگی جۆراوجۆر لەسەر تەختە ڕەشەکە ڕەسم کرابوون، سێ ڕۆژ بوو دڕژانە ڕێژگەی خۆیانەوە. لە پڕو لە ناوەندی مانگی ئوکتوبەردا، پاش هەشت مانگ بێ بارانی، ئەو بەفرە ئەستوورە باری بوو، و ئەو (٢٠) قوتابییەی کە خەڵکی گوندە پەراگەندەکانی ئەو ناو شاخە بوون بۆ قوتابخانە نەهاتبوونەوە. دەبوایە چاوەڕوان بکات تا دنیا خۆش دەبێ‌و ڕێ و بانان دەکرێنەوە. دارۆ، تەنیا ئەو ژوورەی گەرم دەکرد کە خۆی تێیدا دادەنیشت. ژوورەکەی بە تەنیشت ژووری پۆلەکەوە بوو. لە ڕۆژهەڵاتەوە دەیڕوانییە هەڵەتەکە. پەنجەرەی ئەم ژوورەش، وەك پەنجەرەکانی پۆلەکە روەو باشوور دەکرایەوە.

بینای قوتابخانەکە (٢-٣) کیلۆمەترێك لەوێندەرەوە دوور بوو کە هەڵەتەکە بەرەو باشوور نشێو دەبووەوە. لە ڕۆژانی ساف‌و خۆشدا مرۆڤ دەیتوانی ئەو کۆمەڵە شاخە ئەرخەوانییە ببینێ کە دەتوت دەرگای بیابانەکەی ئەو دیویەتی.

دارۆ کەمێك گەرمی بووەوە. هاتەوە بەر ئەو پەنجەرەیەی کە یەکەمجار دوو پیاوەکەی لێوە بینی. کەوتبونە نەدیوی. کەواتە ڕێگە سەختەکەیان بڕی بوو. ئاسمان زۆر تاریك نەبوو. دوێنێ شەو بەفر نەباری بوو.

بەیانی، بە رووناکییەکی تەڵخ چاوی کردەوە. هەر چەند هەورەکە کەمێك ڕەوی بووەوە، بەڵام دنیا هەر تەڵخ و تاریك بوو.

سەعات دووی پاش نیوەڕۆ بوو، کەچی لە تۆ وایە تازە ڕۆژ دەستی پێدەکرد. بەڵام ئەمڕۆ لەو سێ ڕۆژە چاکتر بوو، کە دنیا یەکپارچە تاریکستان بوو. بەفرێکی ئەستور باری بوو. با بەگڤ و هۆڕ دەرگا دوو تاکییەکەی پۆلەکەی رادەتەکاند. دارۆ بە چەند ساعات لەم ژوورەدا دەمایەوە تەنیا بۆ ئەوە لە ژوور وەدەر دەکەوت کە سەرێکی عەمارەکە بدات، دان بە مریشکەکان بدات و هەندێ ڕەژوو بێنێ. خۆشبەختانە ئوتومبیلەکەی (تاجید) کە نزیکترین گوندی باکوورە، دوو

رۆژان بەر لەم بەفرو بۆرانە، ئازووقەی بۆ هێنابوو،و رۆیی بوو. دوای چل و هەشت سەعاتی دی دەگەڕایەوە.

بەراستی هێندەی ئازووقە لەلا بوو کە ترسی لە هیچ جۆرە ئابلوقەیەك نەبێ. ژوورێکی بچکۆلەی هەبوو پڕ بوو لە گونییە گەنم، ئیدارە لەوێندەرێی عەمار کردبوو، تا بەسەر ئەو قوتابیانەدا دابەش بکرێ کە خێزانەکانیان تووشی نەهاتیو وشکە سالّی بوو بوون. بەڕاستی گوندنشینەکان کەساس و داماو بوون و قوربانی قاتی و وشکە سالّ بوون. بێکارو دەست کورت بوون. دارۆ، هەموو رۆژێ بەشە خواردنێکی بەسەر منداڵەکاندا دابەش دەکرد. دەیزانی لەم رۆژە سەخت و دژوارانەدا وەزعیان خراپ بووەو خواردنیان نەماوە. بۆیە پێشبینی دەکرد کە ئەم پاش نیوەڕۆیە بابی یەکێکیان یان برا گەورەی یەکێکیان پەیدا ببێ‌و بەشە ئازووقەی هەموویانی پێدا بنێرێ.

هەڵبەتە دەبوایە هەوڵی بدایە ئەم گەنمە بیانگەیەنێتە وەرزی ئایندەو هەنگینێ کەشتی پڕ لە گەنم لە فەرەنساوە دەگەیشتن و ئێدی لەم تەنگانەیە دەردەچوون.

ئەستەم بوو ئەم وەزعە نالەبارە لە بیر بکرێ، ئەم هەژارییە، ئەم کولەمەرگییە، ئەو لەشکرە تارماییە شڕپۆشە سەرگەردانەی بەر هەتاو، ئەو دەشتە سوتاوە هەڵپرۆکاوە بە خۆڵەمێش بووە، ئەو زەمینە تینووە شەقار بووە، ئەو بەردانەی کە لە بن پێیاندا دەبوون بەخۆڵ، ئەستەم بوو ئەمانە لە بیر بچنەوە، هەزاران مەڕو ماڵات،و چەندین بنیادەم لێرەو لەوێ مردبوون، بێ ئەوەی کەسێك پێ بزانێ. لە ناو جەرگەی ئەم کولەمەرگییەدا، ئەو کە وەك رەبەنان لە قوتابخانە دوورە دەستەکەی خۆیدا دەژیا، بە ژیانی هەژارانەو سەخت قاییل بوو. لە نێو چوار دیواری گەچیندا، لەنێو ئەو تەختە باریکانەدا، تاقە رەنگ نەکراوەکان، بیری ئاوی هەبوو بەشی خۆراکی هەفتانەی هەبوو، خۆی بە پاشا دەزانی. لە پڕ ئەم بەفرە، بێ ئەوەی خەبەر بدات، بێ ئەوەی دڵۆپە بارانێك ببارێ، نیشتبووە سەر زەوی. ئەمە وەزعی ئەوێ بوو، هەرچەندە ژیان لەوێندەر، تەنانەت بەبێ بەشەرەکانیشی کە بوونیان نەیدەکردە هیچ، تاقەت پروکێن بوو، بەڵام دارۆ لەوێندەر لە دایك بوو بوو: هەر شوێنێکی دی بۆ ئەو حوکمی مەنفای هەبوو.

لە ژوورەکە وەدەرکەوت، لەسەر سەکۆکەی بەردەم قوتابخانەکە وەستا. دوو پیاوەکە گەیی بوونە ناوەندی هەورازەکە. سوارەکەی ناسییەوە: باڵدوچی بوو: ئەو پیرە جەندرمەیە بوو کە لە مێژ بوو دەیناسی، باڵدۆچی سەری پەتێکی بە دەستەوە بوو. کابرایەکی عەرەبیش بەدەست بەستراوی، سەری دانەواندبوو، بە دوایدا دەهات. جەندرمەکە بە دەست سڵاوی کرد، دارۆ هێندە غەرقی تەماشای کابرای عەرەب بوو بوو، نەیتوانی سڵاوەکەی بسەنێتەوە. کابرای عەرەب دیزداشەیەکی شینی کاڵی تاڵکێشی لەبەردابوو. پابوجێکی شڕی لە پێدا بوو، بەڵام گۆرەوی ئەستووری خوری لە پێدابوو، چەفییەیەکی کورت و باریکی لەسەر کردبوو. بەرەبەرە نزیك دەبوونەوە، باڵدوچی، جڵەوی ئەسپەکەی دەگرت تا کابرای عەرەب ئازاری نەگاتێ و بریندار نەبێ. هەردووکیان سەڵانە سەڵانە دەهاتنە بەرەوە.

باڵدوچـی، لـه دووری دەنـگ ڕەسـەوە، گـازی کـرد: (بـه سـەعاتێك ئـەو سـێ کیلۆمـەترەی نێـوان (العمـور) و ئێرەمـان بڕیـوە.) دارۆ وەڵامـی نەدایـەوە. بـەو چاکەتە خوریيـەوە کـوڵ و چـوار شـانە دەینواند. دەیبینین کـه سـەردەکەوتن، کابرای عـەرەب بـۆ تاقـە جارێکیش سـەری هەڵنـەبڕی بـوو. وەختێ گەیشتنە بەر هەیوانەکە دارۆ وتی: ( بەخێربێن، فەرموونە ژوورێ خۆتان گەرم بکەنەوە. ) باڵدوچی بێ ئـەوەی سـەری پەتەکـە بـەر بدات، بـە ڕووی گرژو مۆنـەوە لـە ولاخەکـە دابـەزی. لـەبن سمێڵە زبرو کورتەکەیەوە. بزەیەکی بە ڕووی، مامۆستادا دا. چاوە چکۆلەو ڕەشەکانی کە لـە ژێـر تەوێڵی تاوەگازیدا بە قووڵاچوبوون و چرچ و لۆچ کەوتبوونە ئەم لاو ئـەولای دەم و پلـی دیمـەن و ڕوخسارێکی وریاترو هۆشیارتریان پێدەبەخشی. دارۆ، هەوسارەکەی لێ وەرگرت. ئەسپەکەی بـرد بـۆ ژێـر کەپرەکـە، ئـەوجا گەڕایـەوە بـۆ لای ئـەو دوو پیـاوە کـە لـە حەوشـی قوتابخانەکـەدا چـاوەڕێیان دەکـرد.. بردنییـە ژوورەکـەی خـۆی وتـی: (دەچـم ژووری پۆلەکـە گـەرم دەکـەم، لـەوێ چـاتر ئیسـراحەت دەکـەین.) کـاتێ بـۆ ژوورەکـەی خـۆی گەڕایـەوە، باڵدوچـی لەسـەر تەختەکـە دانیشتبوو. پەتەکەی خۆی لە دەستی کابرای عەرەب کردبووەوە.

کـابرای عـەرەب لەسـەر چـۆکان و لـە پـاڵ سـۆپاکەدا دانیشـتبوو. هێشـتا دەسـتەکانی هـەر بەسترابوون. چەفییەکەی سەری بە پشتدا چووبوو. دەیڕوانییە پەنجەرەکە. دارۆ، سـەرەتا چـاوی بەلێوە ئەستوورو سافەکانی کەوت کە کەم کەم دابێژێك لە لێوی زەنگیان دەچوو.

چەفییە بە پشتداچووەکەی، تەوێڵی قۆقزو عینادی ئەوی نیشان دەدا. چارەی تاوەگازی کـابرای عەرەب کە لە سەرما ڕەنگی نەمابوو، هێندە نیگەران و سەرکێش دەینواند، کـاتێ کـە ڕوی بـۆ لای دارۆ وەرگێڕاو چاوانی لە دوڕ چاوی بڕی، دارۆ ڕاچڵەکی.

مامۆسـتا وتـی: (بـا بچینـە ئـەو ژوورەی دی تـا چـای بـە نـەعناتان بـۆ لـێ بنـێم) باڵدوچـی وتـی: (مـەمنون، ئەزیەتـە، حـەزم دەکـرد ئیسـراحەتێ بکـەم). ئـەوجا ڕووی کـردە زیندانییەکـەی و بـە عەرەبی وتـی: (هەسـتە) کـابرای عـەرەب ڕابـوو، دەسـتە بەسـتراوەکانی لـە بـەردەم خۆیـدا گرتبـوو، هێدی هێدی بۆ ژووری پۆلەکە ڕۆیی..

دارۆ، لەگـەڵ چایەکەدا کورسیەکیشـی هێنـا. باڵدوچـی لەسـەر نـزیکترین ڕەحلـەی نێـو ژوورەکـە دانیشـتبوو. کابرای عـەرەب پشـت لـە مێـزو کورسـییەکەی مامۆسـتاو ڕوو لـە سـوپاکە، کـەوتبووە نێـوان مێـزو پەنجەرەکـەوە، هەڵتروشـکابوو، دارۆ، کـاتێ پەرداخـە چایەکەی بـۆ زیندانیەکـە درێـژ کردو دستە بەستراوەکانی بینی حەیرما، وتـی: (دەسـتی بکەینـەوە باشـتر نییـە.) باڵدوچـی وتـی: (بـا، ئەمـە تـەنیا بـۆ ڕێگـا بـوو) و ویسـتی هەسـتێ بـەڵام دارۆ پەرداخـە چایەکەی لەسـەر زەوی دانابوو، لە بەردەم کابرای عەربداو لەسەر چۆکان دانیشت. کابرای عەرەب بێ ئەوەی ورتە بکـات، چـاوە سـوورهەڵگەڕاوەکانی تـێ بـڕی. وەختـێ کـە دەسـتی کرانـەوە، مەچـەکە هەڵاوسـاوەکانی شـێلان. پەرداخـە چایەکەی هـەڵگرتو بـەفڕی بچووكو خێـرا کەوتـە خواردنـەوەی چایەکە. دارۆ وتی: (ئێ بڵێ بزانم کێوە دەچن؟) باڵدوچی دەمی لـە چایەکە هـەڵگرتو وتـی: (بـۆ ئێـرە، ئـازیزم) دارۆ وتی: (بە ڕاستی جووتە قوتابییەکی سەیرن! ئەمشەویش لێرە دەمێننەوە؟!)

– نەخێر، من دەگەڕێمەوە بۆ (العمور)، تۆش ئەم یارۆیە دەدەیە دەست (تینجویت) پۆلیسی ئەویٚ چاوەروانی دەکەن.
باڵدوچی بەدەم بزەیەکی دۆستانەوە دەیڕوانیە ئەو.
مامۆستا پرسی: (ئەوە چ دەڵێی، پێم رادەبوێری؟)
– نا، کوڕی خۆم، ئەمە فەرمانە فەرمان.
– فەرمان؟ من ناتوانم.. ئەوجا هەڵوەستەیەکی کرد، چونکە نەیدەویست ئەم پیرە جەندرمەیە بشەمزێنیٚ.. (دەمەویٚ بڵێم ئەمە کاری من نییە)
– چی؟ مەبەستت چییە؟ لەسەردەمی جەنگدا خەڵکی هەموو کارێك دەکەن.
– کەواتە دەبیٚ چاوەڕێی راگەیاندنی جەنگ بم!
– زۆر چاکە، بەڵام فەرمانەکە دەبیٚ جێبەجیٚ بکریٚ، و تۆ لە کەس زیاتر نیت. پێدەچیٚ هەندیٚ روداوان بەڕێوە بن. بەجدی باسی شۆڕش دەکریٚ. ئێمەش خەریکە خۆ ساز دەدەین.
دارۆ، هێشتا هەر لاسارانە دەیڕوانی.
باڵدوچی وتی: (گوێ بگرە گیانە. من تۆم خۆش دەویٚ بۆیە ئەم قسانەت لەلا دەکەم. ئێمە لە (العمور)دا تەنیا (١٢) کەسین‌و دەبیٚ ئاگامان لە سەرانسەری ئەم ناوچەیە بیٚ‌و پێویستە بەلەز بگەڕێمەوە. بە منیان وتووە ئەم پیاوە بە تۆ بسپێرم‌و بەپەلە بگەڕێمەوە. نەدەکرا لەویٚ گلی بدەینەوە. خەڵکی گوند خەیاڵیان خراپ بوو، دەیانویست بە تۆبزی لێمانی بسەننەوە. تۆ دەبیٚ سبەینیٚ بەر لە رۆژاوا بیبەی بۆ (تینجویت) بیست کیلۆمەتر رێگە بۆ کەسێکی بەتاقەتی وەك تۆ چ نییە. پاشان دەگەڕێیتەوە سەر قوتابخانەکەی خۆت و دەست بە دەرس و دەوامی خۆت دەکەیەوە.)
لە پشت دیوارەکەوە دەنگی ئەسپەکە دەهات کە دەیپڕماند و سمکۆڵانی دەکرد. دارۆ، لە پەنجەرەکەوە دەیڕوانییە دەریٚ، دنیا بەرە بەرە ساف دەبوو، روناکی، هەڵەتە بەفر گرتووەکە زیاتر دەبوو. دوای توانەوەی هەموو بەفرەکە، دیسان هەتاو دەست بەکار دەبووەوە، زەمینی دەسووتاند. ئاسمانی ساف جارێکی دی تیشکی گەرمی بیٚ بڕانەوەی خۆی بەسەر ئەو هەڵەت و دەشتە بەرینەدا دەڕشتەوە کە جێی بنیادەم نەبوو.
روی کردە باڵدوچی‌و وتی: بە هەر حاڵ با واز لەم قسانە بێنین، ئەمە چیی کردووە؟ بەر لەوەی جەندرمەکە زار هەڵێنیٚ، پرسی:
– فەرەنسی دەزانیٚ؟
– نەخێر، تاقە وشەیەك نازانیٚ. مانگێك بوو بە دوایدا دەگەڕاین، شاردبوویانەوە. پس مامی خۆی کوشتووە.
– دژی ئێمەیە؟
– باوەڕ ناکەم. بەڵام پیاو چوزانیٚ.
– بۆ کوشتوویەتی؟

– پێم وایە، لە بەینی خۆیاندا شەڕیان بووە. وا بزانم یەکێکیان گەنمی لە لای ئەوی تریان بووە. ئەوەی مەعلومە ئەوەیە کە کوڕە مامەکەی خۆی بە کێرد سەربڕیوە، وەك مەڕ گۆشاو گۆش سەری بڕیوە.

بە ئیشارەت، دەستی وەك چەقۆ بە ملی خۆیدا هێنا. کابرای عەرەب کە ئەمەی بینی، بە نیگەرانییەوە لێی روانی. دارۆ، لە پڕ لە ناخی خۆیەوە رقی لە کابرا هەستا، رقی لە هەموو خەڵکانی بە کەربەو کین، رقی لە تینوانی خۆین رشتن هەستا.

دەنگی گیزە گیزی کتری سەر سۆپاکە دەهات، چای بۆ باڵدوچی تێکرد پاشان بۆ کابرای عەرەبیشی تێکرد، ئەمجارەش زۆر بە تامەزرۆیی خواردییەوە. عەرەبەکە دەستەکانی کێشماندا و یەخەی دیزداشەکەی کرایەوە. مامۆستا، سینەی رەق و تەق و پیاوانەی بینی.

باڵدوچی وتی: مەمنون کوڕم. ئیّ، ئیدی من دەڕۆم.

هەستا، پەتێکی بچووکی لە بەرکی دەرێناو بەرەو لای عەرەبەکە چوو.

دارۆ، بەساردییەوە وتی: دەتەویّ چ بکەی؟

باڵدوچی، بەسەرسامی پەتەکەی نیشاندا.

– پێویست ناکا.

جەندرمە پیرەکە بە دوو دڵییەوە وتی: کەیفی خۆتە، خۆت دەیزانی، بێگومان چەکت هەیە!

– دەمانچەم هەیە.

– لە کوێیە؟

– لە جانتاکەم دایە.

– دەبیّ نزیکی قەرەوێڵەکەت بیّ.

– بۆ؟ من ترسم لە خۆم نییە.

– تۆ شێتی کوڕم. ئەگەر شۆڕش هەڵگیرسیّ، ئیدی کەس لە خۆی ئەمین نابیّ، من‌و تۆ نامێنیّ

– بەرگری لە خۆم دەکەم، تا ئەوان دەگەنە ئێرە من فریای خۆم دەکەوم.

باڵدوچی، لە قاقای پێکەنینی دا. لەپڕ سمێڵی ددانە سپییەکانی داپۆشی.

– فریا دەکەوی؟ زۆر باشە. منیش دەمویست ئەمەت پیّ بڵێم. تۆ هەمیشە هەر کەللە رەق بووی بۆیە تۆم خۆش دەویّ، لە کوڕەکەی من دەچی.

دەمانچەکەی دەرهێناو لەسەر مێزەکە داینا.

– بۆ خۆت. لێرەوە تا (العمور) دوو چەکم نەگەرەکە.

دەمانچەکە لەسەر مێزە رەشەکە دەبریقایەوە. کە پیرە جەندرمەکە رووی کردە ئەو، بۆنی چەرم و ئەسپ بە کەپوی مامۆستا داچوو.

دارۆ، لە نکاوڕا وتی: گوێ بگرە باڵدوچی، ئەم کارانە بیّ تاقەتم دەکەن. بە تایبەتی ئەم یارۆیە. بەڵام تەسلیمی ناکەم، ئەگەر شت بێتە سەر راستی ئەوا شەڕیش دەکەم، بەڵام تەسلیمی ناکەم. پیرە جەندرمەکە رووبەرووی وەستاو بە تووڕەیی نیگای کرد، بە ئەسپایی وتی: خەریکە خۆت گەوج دەکەی. راستت دەویّ منیش ئەم کارەم پیّ خۆش نییە. بینادەم پاش ساڵەهای ساڵ کە بە

بەردەوامی پەت لە ملی مەحکومان دەکات، ئەوجا کە نۆرەش دێتە سەر مەحکومێکی تازە دەستی تێ ناچێ. مرۆڤ خەجاڵەت دەبێ، بەڵێ شەرمەزار دەبێ، بەلاّم خۆ ناشکرێ ئەمانە هەروا بەرەڵلاّ بکرێن.

دارۆ وتی: دەمن تەسلیمی ناکەم.

– جارێکی دی دوبارەی دەکەمەوە کە ئەمە فەرمانە کوڕی خۆم.

–زۆر چاکە، پێیان بڵێ کە دارۆ دەڵێ: تەسلیمی ناکەم.

باڵدوچی ویستی بیر بکاتەوە. روانییە کابرای عەرەب و ئەوجا دارۆ. ئەنجام بڕیاری خۆی دا.

– نە، هیچیان پێ ناڵێم. من هیچ ناڵێم. دەستوورم پێ بوو کە ئەم زیندانییە تەسلیم بکەم، منیش ئەو کارە دەکەم. تۆ تەنیا ئێرە بۆ من ئیمزا بکەو تەواو.

– پیویست بە ئیمزا ناکات. من حاشا ناکەم لەوەی کە تۆ بەدەستی منت سپاردووە.

– دەنزانم حاشاناکەی. تۆ خەڵکی ئەم ناوەیتو سەر راستی.. بەلاّم دەبێ ئەمەم بۆ ئێمزا بکەی. قانون وا دەخوازێ.

دارۆ، چەکمەجەی مێزەکەی راکێشا، شووشەیەك مەرەکەبی وەنەوشەیی چکۆلەی چوارگوشەو قەڵەمێکی داری سووری سەر درشتی دەرهێنا، کە بۆ نووسینەوەی سەر مەشقەکان بەکاری دەهێنا، ئیمزای بۆ کرد. جەندرمەکە، بە کاوەخۆ کاغەزەکەی قەدو نوشت کردو خستییە جزدانەکەیەوەو بەرەو دەرگا وەڕێ کەوت.

دارۆ وتی: تا بەر دەرگا لەگەڵت دێم.

باڵدۆچی وتی: نەخێر، پێویست ناکات وێڵ و ماریفەت بنوێنی تۆ سوکایەتیت پێ کردم.

روانییە کابرای عەرەب کە بەبێ جووڵە لە جێی خۆی دانیشتبوو. بە کەسەرەوە هەناسەیەکی هەڵکێشا، بەرەو دەرکە رۆیی ووتی: خوا حافیز کوڕم.

دەرگاکە لە پشتییەوە داخرا. باڵدوچی لە پڕ لە بەردەم پەنجەرەکەدا بەدیار کەوتو دیسان کەوتەنە دیوی، بەفرەکە دەنگی پێیەکانی هەڵدەمژی. لەو دیو دیوارەکەوە ئەسپەکە تەکانی دا، چەند مریشکێك لە ترساندا رەوینەوە. دوای تۆزێکی دی هەمدیس لە پەنجەرەکەوە بەدیار کەوتەوە. هەوساری ئەسپەکەی گرتبوو، و بە دوی خۆیدا رای دەکێشا. بێ ئەوەی ئاوڕی پاش بداتەوە بەرەو رێگا سەختو دژوارەکە نشێو دەبووەوە. لە پێشدا خۆی کەوتە نەدیوی ئەوجا ئەسپەکە. دەنگی بەردێکی غلەوە بوو هاتە گوێی. دارۆ گەڕایەوە بۆ لای زیندانییەکە، لە جێی خۆی نەجولاّبوو، بەلاّم چاویشی لە دارۆ نەدەگواستەوە. بە عەرەبی وتی: سەبر بکە.

بەرەو ژووری نووستنەکەی چوو. بەلاّم لە نێو دەرگاکەدا بیری کردەوە، گەڕایەوە، دەمانچەکەی لە چاوی مێزەکە دەرهێناو خستییە گیرفانییەوە. ئەوجا بێ ئەوەی ئاوڕی پاشەوە بداتەوە، بۆ ژوورەکەی خۆی چوو.

ماوەیەك لەسەر قەرەوێڵەکەی راکشا، روانییە ئاسمان، ئاسمان بەرە بەرە تاریکتر دەبوو. گوێی لە بێدەنگییەکە گرت، هەمان ئەو بێدەنگییە بوو کە لە رۆژانی هەوەڵی جەنگدا ئازاری دەدا. داوای کردبوو لە شارێکی بچووکی بناری هەڵەتەکاندا کارێکی پێ بسپێرن، ئەو هەڵەتانەی کە بیابانو

دەشـتـەكانی لـە زنجـیرە چـیاكان جیـادەكردەوە. لەوێـدا، دیـواری بـەردینی سـەوزباوی رەش لـە باكوردا هەبوو، دیواری قاوەیی و ئەرخەوانی لە باشووردا هەبوو، ئەم دیوارە سنووری هـاوینێكی هەمیشەیی دیاری دەكرد. ئەوەبوو لە بەشی باكووردا، رێك لە ناوەندی هەڵەتەكەدا كارێكیان پێی دابـوو. سـەرەتا تـەنیایی و گۆشـەگیری ئـەم دەڤـەرەی لەبـەر گـران بـوو، دانیشـتوانی ئـەم دەڤـەرە بـەردبوو. جـار جـار لێرەو لـەوێ چاڵێك بـەدی دەكرا لـە تـۆ وایـە بۆ كشـتوكاڵ كێڵدراوە، كەچـی پاشان دەردەكەوت كە بۆ هەڵكەندنی بەردی بینا، كێڵراوە. لەم دەڤەرەدا تـەنیا بۆ بەرد دورینـەوە زەوی دەكێڵـرا. دوور لــە بــەردەكان توێژاڵــە گڵێكــی تــەنك بەســەر چــاڵەكانەوە دەبینــرا، كــە دێهاتییـەكان بـۆ نـاو باخچـە بچووكەكانیان كۆیـان دەكـردەوە. وەزعـی ئێـرە بـەمجۆرە بـوو: سـێ چـارەگی دەڤەرەكـە بـەردو تـاوێر بـوو، شـاریان لـێ دروسـت دەكـرد، گەشـەیان دەكـرد، ئـەوجا نـەدەمان. پیـاوان پێیـدا تێدەپـەڕین، ئاشـقێنی-یـان دەكـرد، شـەڕیان دەكـردو ئـەوجا گیانیـان لـە دەسـت دەدا. چ كەسـێك لـەم بیابانـەدا، نـە ئـەو، نـە میوانەكـەی بایـەخیان نـەبوو. ئـەوجاش دارۆ دەیزانی كە هیچ كەسێك لەو دووە نەیدەتوانی لە دەرێی ئەو بیابانەدا بەڕاستی بژی.

كاتێ هەستا، چ دەنگێك لە پۆلەكەوە نەهات. وەیزانـی كـابرای عـەرەب هـەڵاتووەو ئێـدی پێویسـت بـەوە ناكـات بڕیـار بـدات، هەسـتی بەشـادییەكی سـەیر دەكـرد. بـەڵام زیندانییەكـە لـەوێ بـوو، لـە بــەینی ســۆپاكەو مێزەكــەدا راكشــابوو، چــاوانی بــڕی بوونــە بنمیچــەكە. لــەو حاڵــەدا لێــوە ئەستوورەكانی زەقتر دیار بوون و رقی مرۆڤیان هەڵدەستاند. دارۆ وتی: وەرە.

كابرای عەرەب هەر هەستاو شوێنی كەوت. چوونە ژووری نووستن، مامۆستا كورسییەكی نزیكی مێزەكەی بەر پەنجەرەكەی پێ نیشاندا. كابرای عەرەب بێ ئەوەی چاو لە دارۆ هەڵگرێ، لەسـەری دانیشت.

- برسیتە؟

زیندانییەكە وتی: بەڵێ.

دارۆ مێزێكـی دوو نەفـەری رێـك خسـت. ئـاردو رۆنـی هێنـا، لـە تاوەیەكـدا كێكـی دروسـت كـرد. تـەباخێكی گـازی پێكـرد. كێكەكـەی خسـتە سـەری و خـۆی بـۆ عەمارەكـە چـوو. پـەنیرو هێلكـە، خورماو شیری خاوی موعەلەبی هێنا. كە كێكەكە ئامادە بوو، و پێگەیی لەسەر رەفەی پەنجەرەكە داینا تا سارد ببێتەوە. تۆزێ شیری خەستی بە ئاو روون كردەوەو گەرمی كرد. هێلكـەكانی تێك هەڵشـڵەقاندو هێلكـەو رۆنـی دروسـت كـرد. كـە كـاری دەكـرد، دەسـتی بـەر دەمانچـەكەی بـەرِكی راسـتی كـەوت. قاپەكـەی لـە زەوی دانـا. چـوو بـۆ ژووری پۆلەكـە. دەمانچـەكەی خسـتە چـاوی مێزەكەوەو هاتەوە بۆ ئەم ژوورە. تاریكی شـەو دەسـتی پێكردبوو. چرای هـەڵكردو خـواردنی بۆ كابرای عەرەب دانا، وتی: بخۆ.

كابرای عەرەب، پارچەك كێكی هـەڵگرت. بـە تامەزرۆییـەوە بـۆ دەمـی بـرد، بـەڵام راوسـتا. پرسـی: ئەدی تۆ ناخۆی؟- تۆ جارێ بخۆ، من دوایی دەخۆم.

لێـوە ئەسـتوورەكانی تـۆزێ كرانـەوە. هەڵوەسـتەیەكی كـرد، ئـەوجا بـێ چـەندو چـوون قـەپی بـە كێكەدا كرد. كە لە نان خواردن بووەوە، كابرای عەرەب روانییە مامۆستاو وتی: تۆ قازیت؟

– نەء، من تەنیا تا سبەینێ رات دەگرم.

– ئەدی بۆچی لەگەڵ مندا نان دەخۆی؟

– چونکە برسیمە.

کابرای عەرەب بێ دەنگ بوو. دارۆ هەستا، قەرەوێڵەیەکی سەفەری لە عەمارەکە هێناو لە نێوان مێزەکەو سۆپاکە چاکی کرد. بە جۆرێ داینا کە لەگەڵ قەرەوێڵەکەی خۆی گۆشەیەکی قائیمی دروست دەکرد. دوو پەتۆی لە جانتایەکی گەورەی سوچێکی ژوورەکە دەرهێناو لەسەر قەرەوێڵە سەفەرییەکە رای خستن. ئەوجا هەڵوەستەیەکی کرد. بیری کردەوە کە بۆچی ئەم کارانە دەکات. لەسەر قەرەوێڵەکەی خۆی دانیشت. چ کارێکی دی نەبوو تا بیکا چ شتێکی دی نەبوو تا ئامادەی بکات. چاوانی بڕییە کابرا. دەیڕوانییە ئەوو هەوڵی دەدا دەموچاوی ئەو بە تووڕەیی بێنێتە بەرچاوی خۆی. بەڵام بێ سوود بوو. جگە لە دەمێکی چوون زاری حەیوانو چاوانی رەشی بریقەدار چ شتێکی دی نەدەدی. بە دەنگێکی دوژمنانەی ئەوتۆ کە کابرای عەرەبی سەرسام کرد،پرسی: بۆ کوشتت؟

کابرای عەرەب رووی وەرگێڕا

– هەڵاتو منیش دوای کەوتم.

دووبارە روانییە چاوانی کە لێوان لێوی پرسیاری خەم بزوێن بوون.

– چم لێ دەکەن؟

– دەترسیت؟

راست دانیشتو رووی وەرگێڕا

– پەشیمانی؟

کابرای عەرەب بەزاری بەشەوە لێی روانی. پێدەچوو سەری لە قسەکانی ئەو دەرنەکردبێ. دارۆ زیاتر تووڕە بوو. وێڕای ئەوەی کە کەلەشی زەلامی بەزەحمەت لە نێو هەردوو قەرەوێڵەکەدا جێی دەبووەوە، هەستی بە ناڕەحەتیونائەمنی دەکرد. بە ناڕەحەتییەوە وتی: لێرە بخەوە، ئەمە جێی تۆیە.

کابرای عەرەب خۆی نەبزوت. رووی کردە دارۆ وتی:

– دەمویست پرسیارێك بکەم؟

مامۆستا لێی روانی:

– سبەی جەندرمەکە دێتەوە؟

– نازانم.

– تۆ لەگەڵمدا دێی؟

–نازانم، بۆچی؟

زندانییەکە هەستا. لەسەر جێگەکەی خۆی راکشا. لاقەکانی روو لە پەنجەرەکە بوون. تیشکی گڵۆپەکە راستەوخۆ لە چاوانی دەدا. ئەویش یەکسەر نوقاندی.

دارۆ لە کەنار قەرەوێڵەکەدا وەستاو دووبارە وتی: بۆچی؟

کابرای عەرەب چاوی لەبەر تیشکە توندەکەدا کردەوەو روانییە ئەو، هەوڵیدا چاو نەتروکێنێ، وتی: تۆش لەگەڵماندا وەرە. دارۆ، تا نیوە شەویش هەر خەو نەچوو بووە چاوانی. تەواو خۆی رووت کردبووەو لەسەر قەرەوێڵەکە راکشابوو، هەموو جار هەر بە رووتی دەنووست. کەچی وەختێ بیری لەوە کردەوە کە هیچی لەبەر نییە، دوچاری گومان و دوو دڵی بوو. هەستی بە نا ئەمنی کرد. کەوتە وەسوەسەی ئەوەی کە جل لەبەر بکات. ئەوجا شانەکانی هەڵتەکاند. ئاخر خۆ ئەو منداڵ نەبوو، ئەگەر کاربهاتبایەتە سەر راستی دەیتوانی حەریفەکەی بکات بە دوو لەتەوە. لەسەر قەرەوێڵەکەیەوە چاوی بڕییە ئەو، کابرای عەرەب بە پشتا نووستبوو. چاوەکانی نوقاند بوون‌و جۆڵەی لێوە نەدەهات. دارۆ، کاتێ کە گڵۆپەکەی تەمراند، چڕیی تاریکییەکە چەند بەرانبەر بوو. شەو بەرەبەرە لەنێو پەنجەرەکەوە کە ئاسمانی بێ ئەستێرە بە ئارامی لە بزاڤدا بوو، دووبارە گیانی وەبەرکەوتەوە. زۆری نەبرد، مامۆستا چاوی بە تاریکییەکە راهات‌و توانی کابرا عەرەبەکە لەسەر جێگایەکەی خۆی بنوێنێ. کابرای عەرەب دیسان بێ جووڵە بوو، بەلاّم لەوە دەچوو چاوی کراوە بێ. کزە بایەك بە دەوری قوتابخانەکەدا هەڵیکرد. پێدەچوو هەورەکان راماڵێ‌و دووبارە هەتاو دەربکەوێ. بایەکە توندی کرد. مریشکەکان تۆزێ پەڕوباڵیان راوەشاندو ئەوجا بێدەنگ بوون. کابرای عەرەب بە تەنیشتا تلی داو پشتی کەوتە دارۆ. ئەوجا دارۆ گوێی بۆ دەنگی هەناسەی میوانەکەی کە قووڵترو رێك تر دەبوو، هەڵخست، گوێی بۆ ئەو هەناسانە هەڵخست کە زۆر لێوەی نزیك بوون. ئەوجا بێ ئەوەی بتوانێ چاوان لێك بنێ لە فکرانڕا چوو. ئا لەم ژوورەدا کە ساڵێك بوو بە تەنیا لێی دەنووست، بوونی ئەم کابرا عەرەبەی لەبەر گران بوو. ئامادەبوونی ئەو، جۆرە برایەتییەکی بەسەردا دەسەپاند کە لەو وەزع و حاڵەدا پێی قبوڵ نەدەکرا. ئەو پیاوانەی کە پێکەوەو لەژێر یەك بنمیچدا بەسەر دەبەن، سەربازان یان زیندانییان، بە هەموو ناکۆکییەکیانەوە، هەست بەجۆرە نزیکییەکی سەیر دەکەن، هەموو شەوێ کە چەك و جلەکانیان دادەنەن، لە تۆ وایە لە هاوبەشی دێرینە خەون و ماندووبوندا دەبن بەیەك، بەلاّم دارۆ، بەخۆیدا هاتەوە، لەم بیرانە بێزار بوو، پیویستی بە خەو بوو.

بەلاّم دوای تۆزێك کە کابرای عەرەب کەمێك جوولاّ، مامۆستا هێشتا نەخەوتبوو. کاتێ کە زیندانییەکە دووبارە جوولاّ، ئەو گوێ قوڵاّغ بوو، خۆی ئامادەکرد. کابرای عەرەب وەك یەکێك بەدەم خەوەوە بڕوات، تۆزێك لەسەر باسکەکانی بەرز بووەوە.

راست‌و قیت لەبەر قەرەوێڵەکە رۆنیشت. بێ ئەوەی روو بکاتە دارۆ، بێ جووڵە چاوەڕێی کرد. دەتوت بەوردی گوێی دەگرت. دارۆ لەجێی خۆی نەجوولاّ. لەپڕ بیری کەوتەوە کە دەمانچەکەی هێشتا لە چاوی مێزەکەدایە. چاکتر وابوو یەکسەر دەست بەکار بێ. بەلاّم هێشتا چاودێری زیندانییەکەی دەکرد کە بە هەمان رەفتاری ئارام پێیەکانی نایە سەر زەوییەکە. دیسان چاوەڕوانی کرد، ئەوجا هێدی هێدی بە پێوە وەستا. دارۆ دەیویست بانگی بکات. بەلاّم ئەو زۆر ئاسایی‌و بە بێدەنگی دەستی بە رۆیشتن کرد. بەرەو ئەو دەرگەیە دەچوو کە لەو سەری ژوورەکە بوو، بەسەر کەپرو عەمارەکەدا دەکرایەوە. زۆر بە ئەسپایی دەرگاکەی کردەوە، وەدەرکەوت‌و دەرگاکەی پاڵنا بێ ئەوەی دای بخات.

دارۆ نەجوولاّ، بیری کردەوە: "هەڵدیّ. زۆر چاکە. سەرم رەحەت دەبیّ!" لەگەڵ ئەمەشدا، بە وردی گوێی دەگرت. مریشکەکان نەیان قریشکاند. دیارە گەییوەتە هەڵتەکە. دەنگی شۆڕە شوڕی ئاوی هاتە گویّ، هێشتا نەیدەزانی چ دەکات کە کابرای عەرەبی لە نێو ئاستانەی دەرگاکەدا بینی. دەرگاکەی بە ئەسپایی داخستو بەبێدەنگی بەرەو قەرەوێڵەکەی هات. ئەوجا دارۆ، پشتی تێکردو خەوت.

لە غوڕابی خەودا بوو کە وای هەست دەکرد لە دەوروبەری قوتابخانەکەدا دەنگی دزە هەنگاوان دەژنەویّ.

لە دڵی خۆیدا وتی: (هیچ نییە خەون دەبینم خەون!) هێشتاش هەر لە خەودا بوو.

کاتیّ بێدار بووەوە، ئاسمان ساف بوو، هەوایەکی پاك و فێنك لە پەنجەرەکەوە وەژوور دەکەوت. کابرای عەرەب لە ژێر نوێنەکاندا خۆی گرمۆڵە کردبوو. زاری بەش کرد بووەوەو بەوپەڕی ئاسوودەیی خەوت  بوو. بەلاّم کە دارۆ رای تەکاند، بە ترسەوە لە خەو راچڵەکی و بە چاوانی پڕ نیگەرانییەوە لە دارۆ راما. دەتوت یەکەمجارە ئەو دەیبینیّ. ترسێکی وەها لە سیمایدا بەدی دەکرا کە دارۆ پاشەوپاش کشایەوە.

– مەترسە. منم. وەختی تاشتە. کابرای عەرەب سەری لەقاندو وتی: باشە. سیمای ئارام بووەوە، بەلاّم نیگای هەر نیگەران بوو.

قاوە ئامادەبوو. هەردووکیان لەسەر قەرەوێڵە سەفەرییەکە دانیشتن و قاوەو کێکیان دەخوارد. ئەوجا دارۆ کابرای عەرەبی بۆ ژێر کەپرێك برد، دەستشۆرێکی نیشاندا تا دەستەکانی بشوات. گەڕایەوە ژوورەکە. نوێنەکان و قەرەوێڵە سەفەرییەکەی هەڵگرت. قەرەوێڵەکەی خۆی چاك کردو ژوورەکەی کۆکردەوە.. ئەوجا بەنێو پۆلەکەدا چوو بۆ بەر هەیوانەکە. هەتاو بە بەرۆکی ئاسمانی شینەوە، روناکییەکی هێدی و درەخشانی بەو هەڵەت و بانە چۆڵەدا پەخش دەکرد. بەفرەکە، لەسەر بەرزاییەکان و لێرەو لەویّ دەتوایەوەو بەردەکان بەرە بەرە بەدیار دەکەوتن.

مامۆستا لەبەر هەیوانەکەدا وەستابوو، باڵدوچی بیر کەوتەوە، خراپ رەنجاند بووی ، بە جۆریّ وەدەری نا وەك بڵێی نەیەویّ جارێکی دی پێوەندی لەگەڵیدا هەبیّ. دوعا خوازی جەندرمەکە، هێشتا لە گوێیدا دەنگی دەدایەوەو بیّ ئەوەی هۆیەکەی بزانیّ هەستی بە ناڕەحەتی دەکرد. لەم کاتەدا زیندانییەکە لەو سەری قوتابخانەکەوە کۆکی. دارۆ، بیّ ئەوەی بیەویّ گوێی بۆ دەنگی ئەو رادێرا، ئەوجا بە تووڕەیی بەردێکی هاوێشت. بەردەکە بەگڤە گڤ لە بەفرەکەدا رۆچوو. تاوانی گەوجانەی کابرا ئەوی بیّ تاقەت کرد بوو. بەلاّم تەسلیم کردنی کارێکی ئابڕوومەندانە نەبوو. تەنانەت بیرکردنەوەش لەم کارە، هەستی سووك بوونی لەلای دروست دەکرد. لە هەمان کاتدا کە لە دڵی خۆدا جوێنی بەوانە دەدا کە کابرای عەرەبیان بۆ لای ئەو ناردبوو، جوێنی بە کابرای عەرەبیش دەدا کە پیاوی کوشتبوو، رایەنەکردبوو. دارۆ هەستا. بە دەوری هەیوانەکەدا سووڕایەوە. هەڵوەستەیەکی کردو ئەوجا بۆ ناو قوتابخانەکە گەڕایەوە.

کابرای عەرەب لای کەپرەکە دانەوی بووەوەو بەدوو قامکان ددانەکانی دەشت، دارۆ لێی روانی و وتی: وەرە.

ئەوجا لە پێش کابرای عەرەبدا چوو بۆ ژوورەوە. لەسەر چاکەتەکەی خۆیەوە چاکەتێکی راوی لەبەر کرد، پێڵاوی جەوەڵی لەپێ کرد.
ئەوجا وەستاو چاوەڕوانی کرد تا کابرای عەرەب چەفییەکەی‌و نەعلەکانی لەپێ بکات. چوونە ژووری پۆلەکەوە. مامۆستا ئاماژەی بۆ دەرگەی دەرەوە کرد وتی:
– برۆ.
کابرای عەرەب نەجووڵا. دارۆ وتی: منیش دێم.
کابرای عەرەب وەدەرکەوت. دارۆ، گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی کیسەیەکی پڕ کرد لە نان‌و خورماو شەکر، بەر لەوەی بڕوات تۆزێك لەبەردەم مێزەکەیدا وەستا. ئەوجا لە دەرگەوە وەدەرکەوت‌و قفڵیدا. وتی: ڕێگەکە لێرەوەیە.
ڕێگەی خۆرهەڵاتی گرتەبەرو کابرای عەرەبیش شوێنی کەوت..
بەڵام کە تۆزێ لە قوتابخانەکە دوورکەوتنەوە، وای هەست کرد گوێی لە دەنگێکی سووك بوو. وەستا. ڕوانییە دەوروبەری قوتابخانەکە، چ کەسێکی لەوناوە نەبینی. کابرای عەرەب کە دیار بوو، هیچ حاڵی نەبوو بوو، لەوی دەڕوانی. دارۆ وتی: ڕێکە! سەعاتێکی تەواو ڕێیان کردو ئەوجا لە پاڵ بەرزاییەکی قسلێ دا لایاندا. بەفران خێراتر دەتوانەوەو هەتاو دەم‌و دەست ئاوی چاڵ‌و گۆلەکانی دەخواردەوە.
ئەو دەشت‌و هەڵەت‌و بانەی کە بەلەز وشك دەبووەوەو، وەك هەوا دەلەرییەوە. کە دووبارە کەوتنەوە ڕێ، دەنگی پێیان دەنگی دەدایەوە. جار جارە باڵندەیەك لەبن پێیان هەڵدەفڕی‌و بە دەنگێکی خۆش، ئەو بێدەنگییەی دەشلەقاند. دارۆ، پڕ بەسییەکانی هەوای تازەی بەیانی هەڵدەمژی. بە دیتنی ئەو دەشت‌و هەڵەتە بێ سنوورە، کە ئێستە لە سای ئاسمانی شیندا، سەرانسەر زەرد بوو حاڵی لێدەهات. ئەوجا رووەو باشور بە هەورازەکەدا هەڵگەڕان‌و یەك سەعاتی دی ڕێیان کرد. گەیینە شوێنێکی بەرزی هەموار کە بەردەکانی لە حاڵی کەوتن‌و هەرەسدا بوون. لەوێ بەولاوە ئیدی نشێوی دەستی پێدەکردو لەلای ڕۆژهەڵاتەوە دەگەییە دەشتێکی نزم کە چەند درەختێکی باریکی لێ ڕوا بوو. لەلای باشوورەوە بە چەند چینە تاوێرێك کۆتایی دەهات کە دیمەنێکی تێکەڵ‌و پێکەڵی بەو دەڤەرە دەدا. دارۆ، بە هەردوولادا هەڵیڕوانی. تا چاو بڕی دەکرد ئاسمانی بێ کۆتایی بوو. تاقە بەنی بەشەرێك بەرچاو نەدەکەوت. دارۆ، ئاوڕی لە کابرای عەرەب دایەوە کە سەرسام لەوی دەڕوانی. کیسەکەی بۆ درێژ کردو وتی: بیگرە، ئەمە خورماو نان و شەکرە. بەشی دوو ڕۆژان دەکات.ئەمەش هەزار فرانك بۆ خۆت.
کابرای عەرەب پریاسکەکەی وەرگرت. هەردووك دەستی بەسنگییەوە قەرساند بوو. دەتوت نەیدەزانی چییان لێ بکات. مامۆستا ئاماژەی بۆ ڕۆژهەلات کردو وتی: سەیرکە، ئەم ڕێیە دەچێت بۆ تنجویت. دوو سەعات دەبێ. ئەوجا دەگەیە مەخفەری پۆلیسی تنجویت، لەوێ چاوەڕوانت دەکەن.
کابرای عەرەب کە هێشتا پریاسکەو پارەکەی بەسینگییەوە قەرساند بوو، بەرەو ڕۆژهەلات هەڵیڕوانی. ئەوجا دارۆ قۆڵی گرت‌و هەندێ بە توندی بەرەو باشوور وەری چەرخاند. کوێرە

**رێیەك بە داوێنی ئەو بەرزاییەوە کە لێی وەستا بوون، دەبینرا: ئەمەش رێیەکە بە هەڵەتو دەشتەکەدا تێدەپەڕێ. لێرەوە بە رۆژێك دەگەیە ماڵە مەڕدارەکان. جا ئەوانە بەپێی دابو نەریتی خۆیان جێت دەکەنەوەو پەنات دەدەن.**

**کابرای عەرەب کە بۆ لای دارۆ گەڕابووەوە، ترسێکی سەیر نیشتبووە سیمای. وتی: گوێ بگرە. دارۆ، سەرێکی لەقاندو وتی: نا، قسە مەکە، من ئیدی دەگەڕێمەوە. پشتی کردە ئەوو دوو هەنگاوی هەڕاوی بەرەو قوتابخانەکە هەڵنا. ئەوجا بەپەلە تەمەشایەکی کابرای عەرەبی کرد کە رەق راوەستا بوو. دیسان کەوتەوە رێ. بۆ چەند چرکەیەك جگە لە دەنگ دانەوەی دەنگی هەنگاوەکانی خۆی چ شتێکی نەژنەوتو ئاوڕی نەدایەوە. بەلأم دوای تۆزێك گەڕایەوە. کابرای عەرەب هێشتا هەر لە جێی خۆی وەستا بوو. دەستی هێنابوونە خوارەوەو لە مامۆستای دەڕوانی. دارۆ هەستی کرد شتێك ئەوکی گرتووە. بەلأم کە لە هەموو شتێك بێزار بوو بوو، دەستەکانی هەڵتەکاندو دووبارە کەوتەوە رێ. ماوەیەك رۆیی، دیسان وەستا روانی. کابرای عەرەب دیار نەبوو.**

**دارۆ، گومانی پەیداکرد. هەتاو گەیبووە ناوەندی ئاسمانۆ رێك لەسەری ئەوی دەدا. مامۆستا لە پێشدا بەنا بەدڵیو پاشان بە دڵنیایەوە گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنەی کابرای عەرەبی لێ بەجێ هێشت. وەختێ گەییە لای بەرزاییەکە ئازای لە ئارەقەدا هەڵکشابوو. بە پەلە بە بەرزاییەکەدا هەڵگەڕا، کە گەییە ترۆپکی بەرزاییەکە هەر ئەوەتا هەناسەی پێ دەدرا. تاوێرە بەرزەکانی باشوور چووبوون بە ئاسمانا، بەلأم لە هەڵەتو دەشتەکەی رۆژهەلأتەوە، هەڵمی گەرما بە حەوادا دەچوو. دارۆ، لە نێو تەنکە تەمەکەوە بەدڵێکی غەمگینەوە دەیڕوانیە کابرای عەرەب کە رێگەی زیندانی گرتبووە بەر.**

**مامۆستا. دوای تۆزێك، لەبەر پەنجەرەی پۆلەکە وەستابوو. لەو رووناکییە بێگەردەی دەڕوانی کە سەرانسەری دەشتو هەڵەتەکەی بەبێ جیاوازی لە ئامێز گرتبوو. بەلأم چ شتێکی نەدەدی. تۆزێ پێشتر، لە پشتییەوە، ئەو رستەیەی خوێندبووەوە کە لە نێو رووبارە پێچاو پێچەکانی فەرەنساداو بە خەتێکی ناڕێكو پێكو بە پەلە بە دەباشتر نووسرابوو: (براکەمانت تەسلیم کرد، خۆت دەبینییەوە).**

**روانییە ئاسمان، روانییە دەشتو هەڵتەکەو ئەولاتر کە تا کەناری دەریا دەکشا. ئا لەم ولأتە بەرینەدا، لەم دەڤەرەدا کە زۆری خۆش دەویست، تەنیا بوو.**

**سەرچاوە:**


١- الغريب وقصص اخري/ البير كامو
ترجمة: عايدة مطرجي ادريس
دار الاداب ط٢ ١٩٧٩ ص٦٧- ٨٣


## هەڵسەنگاندنی چیرۆکی میوان

**نووسینی: لایونل تریلینگ**

که دەقی ئینگلیزی ئەم چیرۆکە لەگەڵ دەقە ئەسڵییەکەیدا، کە فەرەنسییە بەراورد بکرێ، ئەوە بەدیار دەکەوێ کە وەرگێڕەکەی، یەکجار وردو کارامە کارەکەی خۆی ئەنجام داوە.
بەڵام لە یەك خاڵی بچووكو لە هەمان کاتدا گرینگ، سەرکەوتنی بەدەست نەهێناوە. نەیتوانیوە بۆ عینوانی چیرۆکە کە هاو واتایەکی گونجاوی ئەوتۆ بدۆزێتەوە کە هەمان ئەو واتایە بگەیەنێت کە لە زمانە فەرەنسییەکەدا دەیگەیەنێت. بەهەر حاڵ، چونکە وشەیەکی ئینگلیزی ئەوتۆ نیە کە بتوانێ مانای وشەی (ئوت hote) کە هەم بە مانای میوان، هەم بە مانای خانەخوێ دێت، بگەیەنێ، بۆیە برادەری وەرگێڕ زۆر جێگەی گلەیی نییە.
ئەم بابەتە کە وشەیەك هەم مانای میوانو هەم مانای خانەخوێ بدات، نادیارەو نابێتە مایەی شێواندنو بە مەتەڵ بوونی مەبەستی قسەکەر، ئەگەر، ئەگەری هەڵە لە ئارادا بوایە، نووسەرە فەرەنسییەکە وشەیەکی بەکار دەهێنا کە ڕێك مانای میوانی بگەیاندایە. لەگەل ئەمەشدا خوێنەرێکی فەڕەنسی کاتێ کە تووشی عینوانی چیرۆکەکەی کامۆ دەبێ نازانێ کام واتا پەسند بکات، تەنانەت پاش تەواو کردنی چیرۆکەکەش تەواو دڵنیا نییە کە عینوانەکە ئاماژەیە بۆ خانەخوێ کە مامۆستا فەرەنسییەکەیە، یان ئاماژەیە بۆ میوان کە کابرای عەرەبی زیندانییە.
ئەلبێر کامۆ، ئەم ئیبهامەی مەبەست بووەو لە نامەیەکدا کە بۆ جوستین ئوبراین-ی وەرگێڕی چیرۆکەکەی ناردووە، داخی خۆی سەبارەت بەوەی کە زەرووڕەتی وەرگێڕان، ئیبهامەکەی لابردووە، دەربڕیوە. تێگەیشتن لەم داخ خواردنەی کامۆ ئەوەندە قورس نییە، چونکە مانای دوولایەنی عینوانی چیرۆکەکە، هەموو مەبەستی چیرۆکەکەی گرتۆتە خۆی. مامۆستاکەو کابرای قاتیل لە ڕوانگەی ویژدانو شارستانییەوە لە دوو جەمسەری موخالیف دانو کاتێ کە دارۆ ناچار دەبێ کابرای عەرەب وەك زیندانییەك لای خۆی گل بداتەوە، پێوەندی هەر یەکێکیان سەبارەت بەوی دی دەگۆڕێ بۆ پێوەندییەکی دوژمنانە. لەگەڵ هەموو ئەمەشدا، ڕەفتاری دارۆ ئەم حاڵەتە دەگۆڕێ. لەبەر ئەوەی کابرای عەرەب لەلای خۆ گل دەداتەوە، ناچار دەبێ خواردنی بداتێو جێگەی بۆ دابین بکات. هەر ئەم ڕەفتارە میوان پەروەرانەیەی ئەوێ کە نیگەرانیو تەنانەت سۆزی ئەو دەوروژێنێ. کابرای عەرەب بەرە بەرە بۆی بەدیار دەکەوێ کە مامۆستاکە پشتیوانی ئەوە. بۆ هەر یەکێك لەم دوو پیاوە، وێڕای جیاوازییان، دەشێت هەمان تاك وشەی عینوانەکە بەکار ببرێ: هەر یەکێکیان (میوان)ی ئەوی تریانە. لە نێو زۆر خەڵکدا (نان ونمەك کردن)ی میوان و خانەخۆێ، پێوەندییەکی مکوم لە بەینیاندا چێدەکات.. پێوەندییەك کە ناشێت پێشێل بکرێ. بەڵام ئەوەی دارۆ هەستی پێدەکات، ڕێزگرتنی ئەم دابو نەریتە باوە نییە، بەڵکو ئەو لە ڕوانگەی کۆمەڵێ سۆزی هەڵقووڵاوی دەروون و ناخی خۆیەوە ئەم دابە دەپارێزی.

سـۆزو گودازێـك كـه لێـوان لێـوه لـه هـەوێنی ئینسـانیو ئـەو لـه هەموویانـدا لەگـەڵ میوانەكەیـدا بەشداره. هەروەها شان به شانی یەكدی هەندێ كاری زەروری ژیان، وەك: خواردن، خـەوتن، ریـتنو میزتنو دەستو چاو شتن، ئەنجام دەدەن.

پێوەنـدی نێـوان ئـەم دوو پیـاوه هەمیشــه دەبــێ كــەم بــێو وەك دیــاره كەمیشــه. بــەلاّم شــته هاوبەشـەكانی نێوانیـانیش كـەم نییـەو بگـره زۆریـش فرەیـەو دارۆ هەست بەمـه دەكـاتو دەیـەوێ چاكەیەكی گـەورەو مایـەی سـەرنج بكـات. ئـەو زەمینـه بـۆ هـەلاّتنی كـابرای عـەرەب خـۆش دەكـاتو ئەمەش خۆی له خۆیدا ئەنجامی پڕ خەتەری بۆ سەر ژیانی ئـەو لێدەكەوێتـەوە.. لەوەیـه سـزای ئـەم كاره نـەقڵ كردنـی ئـەو بـێ لـەم شـوێنەی كـه ئـەو خۆشـی دەوێو پابەندییـەتی، یـان لەوەیـه هـەر لـه وەزیفەی دەوڵەتی دەربكرێ.

ئەو چاكەیەی كه رەنگدانـەوەو نیشـاندەری هەسـتی میـوان پـەروەری دارۆیـه، بـەرەنجامێكی وەهـای نییه. میوانه عەرەبەكه بـه هـەر تـاوانێ دەسـتگیر كرابـێ، كابرایـەكی زەبـوونو دامـاوەو كاتێـك دارۆ، دەرفـەتی بـۆ دەرەخسـێنێ كـه پـەنا وەبـەر سارانشـینانی باشـوور بـەرێو لـه قەڵـەمڕەوی یاسـایی فەرەنسا دەربچێ، رووبەڕووی قبووڵ نەكردنی ئـەو دەبێتـەوە. ئـەو بـاوەڕی بـه دابو نـەریتی میـوان پەروەری ئەو سارانشینانه نییه كه دارۆ، بیری ئەویان دەخاتەوە.

پێدەچێ لێپراسراوانی فەرەنسی كه بڕیاره مەحكەمەی بكەن بەلای ئەمەوه خەتەریان كەمتر بێ وەك لـه خەتـەری سارانشـینانی نەناسـراو. ئـەو ئارەزوومەندانـه دەڕوات بـۆ مەخفـەری پـۆلیس تـا خـۆی تەسلیم بكات.

ئیبهـامی وشـەی (ئـوت) تـەنیا بـەمانای دوو لایـەنی میـوانو خانـەخوێ پەیوەسـت نییـه. ئەگـەر بـه مێژووی ئاڵۆزی ئەم وشەیەدا بچینەوەو ریشـەی وشـەكه لـه زمـانی لاتینیـدا بدۆزینـەوە، ئـەوا بۆمـان دەردەكـەوێ كـه مانـای نـامۆو دوژمـن-یـش دەگەیـەنێت. كـاتێ كـه دارۆ بـۆ پۆلەكـه دەگەرێتـەوەو هەڕەشەی كەسوكارەكانی كابرای عەرەب لەسەر تەختە رەشەكه دەبینێ، ئەوەی بیر دەكەوێتەوه كـه ئەو وێڕای ئەوەی نامۆیەكی بەخشندەیە، له هەمان كاتدا نامۆیەكی خراپـەخوازو دوژمنیشـه. دارۆ، لەگـەڵ ئـەوەدا كـه پیـاوێكی جـەزایری و فەرەنسییه، لـه جـەزایر لـه دایـك بـووه، كـەم و زۆر لەگـەڵ عـەرەبی ئەوێـدا بـێ گیروگرفتو سەریەشـه ژیـاوەو ئـەو شـوێنەی خـۆش دەوێ كـه هەنووكـه لەسـەر پێیه بۆ شۆڕش، بەمەش دەگاته ئەم ئەنجامەی كه لەم ولاّتەدا شوێنێكی نییه.

لەم دوژمنایەتییە گشتییەدا، كاری دارۆ هەر چەنده له ئینسانییەتێكی تاكڕەوانـەوه هـەڵقوولاّوە، چ دەنگدانەوەیەكی نابێو تەنانەت دەبێته مایەی نەفرەتو لێك دووركەوتنەوەش.. ئـەو كـه داواكـانی دەوڵـەتی خـۆی بـه زەبـری هانـدەره مرۆڤانییـەكان رەت دەكاتـەوە، لـه هـەموو لایەكـەوه بـه تـەنیایی مەحكوم دەبێ.

گۆشـەگیری تایبـەتی، جـۆره شـێوەیەكی ژیانـه كـه دارۆ بـۆی گـەڕاوەو بـه دەسـتی هێنـاوە. ئێمـه بـه مەزنده بۆمان دەردەكەوێ كه ئەزموونی ئەو له جەنگی جیهانی دووەمدا بۆته هۆی ئـەوەی كـه دوور له كۆمەڵگەو له زۆر كەس بژی. (دووری لـه خـەڵكان) بـۆ نیشـاندانی ئـەوەی دارۆ هەسـتی پێـدەكات زۆر روون نییه. ئەو به گوتەی خۆی بۆیه تەنەفور له كابرای عەرەب دەكات چونكه تاوانی كوشتنی

ئەنجام داوە، هەروەها تەنەفور لە هەموو کەسێکی کەرب و کین لە دڵ، بوغزاوی و تینووی خوێن رشتن دەکات کە ئەمە خۆی لە خۆیدا هیچی لەو تەنەفورە کەمتر نییە کە لە ئەنجامی بیری هاوکاری کردنی لەگەڵ لێپرسراوانی دەوڵەتدا هەستی پێدەکات. باڵدوچی جەندرمەش کە لە کارەکەی خۆی (شەرمەزارە) لەم هەستەدا هاوبەشی دارۆیە.. هەڵبەتە دارۆ مرۆڤێك نییە کە ئارمانێکی ئامانجداری لە کەللەدابێ و بیەوێ دژی ئیمپریالیزمی فەرەنسا بوەستێ. خۆ لە گوینە لەگەڵ هەڵگیرسانی شۆرشی عەرەبەکاندا، هاوشانی فەرەنسییەکان دژی عەرەب بجەنگێ بە هەرحاڵ، هەست دەکات کە ئەو سەر زەمینەی ئەو بۆ ژیانی خۆی هەڵی بژاردووە چەند هی ئەوە، ئەوەندەش هی عەرەبەکانە: بەتایبەتی ئەم دەڤەرە کە هەموو مەرجە ئەخلاقی و گۆشەگیرییەکانی دڵخوازی ئەوی تێدایەو بوەتە مایەی دووری ئەو لە هەموو ئەو خەڵك و کۆمەڵگەیەی کە مایەی نەفرەت و شەرمەزاری ئەون.

بەلای دارۆوە، پاکی و بێگەردی دەشت و هەڵەتەکە، رەسەنایەتی و جوانییەکی ماڵی نەکراوی گرتۆتە خۆ. ئەو بۆیە ئەم دەڤەرەی خۆش دەوێ، چونکە ئەو گۆشەگیرییەی بۆ فەراهەم کردووە کە ئەو پێویستی پێیەتی لەگەڵ هەموو ئەمەشدا بۆی بەدیار کەوتووە کە فاکتەری غەریزی خەمخۆری، بە دەرکردنی ئەو، لە بەهەشتی بێزارکەری گۆشەگیرییەکەی ئەو کۆتایی دێ. ئەم تەنزە توندو خەمناکەی چیرۆکەکەی کامۆ دەست لە بەرۆکمان بەرنادات. ئایا ئەو لەم بیابانەدا کە بەری کێڵانی، تەنیا بەردو تاوێرە، جێیەکی بۆ حەوانەوە، دۆزیوەتەوە؟!

*          *          *

# ئەلبیر کامۆ

## ١٩١٣-١٩٦٠

کامۆ، بابی فەرەنسی و دایکی ئەسپانییە. لە جەزایر لە دایك بووە. لە ساڵەکانی هەوڵی پاش دووەم جەنگی جیهانی، لەگەڵ ژان پۆل سارتەرو سیمون دی بوڤواردا گرووپی نووسەران، فەیلەسوفان و رەخنەگرانی مولتەزیمی فەرەنسایان پێك هێنا. ئامانجی هاوبەشی ئەمانە خەبتین بوو بۆ بەدەست هێنانی ئازادی، عەدالەت و پاراستنی کەرامەتی مرۆڤ، لە سەردەمی ستەمکارانێکدا کە چاویان بە یەکتردا هەڵنەدەهات.

کامۆ، لە ساڵ ١٩٣٥ وە، واتا لەو کاتانەوە کە خوێندکاری زانستگەی جەزایر بوو، لە جەنگی بانگەشەییدا دژ بە فاشیزم کاری دەکرد. کامۆ لە بەرهەمەکانی خۆیدا مەسەلە گرینگەکانی زەمان، وەك فاشیزم، کۆمەڵکوژی، پاکسازی درندانە، ئیمپریالیزم، سزای مەرگ، ئەشکەنجە، و جیاوازی رەچەڵەکی تاوتۆێ دەکرد. کامۆ بۆ هەر یەکێك لەم مەسەلانە وەلامێکی ئەخلاقی روونی نیشان دەداو دەیخستە روو. ئەو وەك زۆر رۆشنبیری سەردەمی خۆی، بۆچوونەکانی خۆی لە دوو قاڵبی گرینگی ئەدەبیدا، واتە رۆمان و شانۆنامەدا دەردەبڕی. بەرهەمە سەرەکییەکانی کامۆ بریتین لە شانۆنامەی: کالیگولا ١٩٤٤، بەدحاڵی بوون ١٩٤٤، دادپەروەران، هەروەها ئەفسانەی سیزیف ١٩٤٢، مرۆڤی یاخی ١٩٥١ و رۆمانی نامۆ ١٩٤٢ و تاعون. بابەتی زۆربەی بەرهەمەکانی کامۆ (پوچییە) واتا (بێ مانا بوونی، بوونی مرۆڤ لە زەویدا) و هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدا بوو کە چارەسەرێکی ئیجابی بۆ ئەو مەسەلانە بدۆزێتەوە کە پوچگەرایی نیشانی دەدا.

کامۆ لە ئەفسانەی سیزیفدا مرۆڤێك نیشان دەدا کە ناچارە ئەرکێکی پوچ ئەنجام بدات، مرۆڤێك لە هەرەتی ئەنجامدانی ئەرکێکی وەها قورس و دژواریشدا، لە گەیشتن بە بەختەوەری غافڵ نییە، کامۆ، پوچی وەك واقیعێك قەبووڵە، بەڵام بە هەر هەموو ئەو چەکانەی لەبەر دەستیدایە، بەگژیا دەچێت.

لە سالأنی یەکەمی چلەکاندا ١٩٤٠ واقیعی تاڵی داگیر کردنی فەرەنسا لە لایەن سەربازانی ئەڵمانییەوە، گۆڕانێکی بنەڕەتی لە دیدو روانینی کامۆ بۆ جیهان، دروست کرد. لەمە بەدواوە بەرە بەرە لە زەبرو زەنگی شۆڕشگێڕی و بەتایبەتی لە کۆمۆنیزمو فەلسەفەی مێژووی کۆمۆنیزم دوورکەوتەوەو ئیدی لە سارتەرو دۆستەکانی دابڕاو مرۆڤی یاخی نووسی. مرۆڤی یاخی دژایەتییەکی دوو لایەنەی کۆمۆنیزم و ئایینە کە بە زاراوەی فەلسەفی موتوربەکراوە. بلأوبوونەوەی ئەم کتێبە لە ١٩٥٢دا بووە هۆی دەست پێکردنی موجادەلەی توند لە نێوان کامۆو سارتەر کە بە هاوپەیمانی حیزبی کۆمۆنیستی فەرەنسا دەژمێردرا، کامۆ لە بواری کورتە چیرۆکیشدا هەر نووسەرێکی بە تواناو گەورە بووە. کامۆ لە ساڵی ١٩٦٠دا، لەسەردەمێکا کە سەر گوتارەکانی لە رۆژنامەی نهێنی (نەبەرد)ی رۆژنامەی راپەڕینی بەرەڤانی فەرەنسادا، ئومێدی بە جەماوەرێك دەبەخشی کە لە ترسی چەکمەی سەربازانی هیتلەر هەناسەیان پێ نەدەدرا، بە کارەساتی

**ئوتومبێل گیانی لە دەستدا، کامۆ ئەگەر لەم کارەساتەدا نەمردبایە، ئێستە یەکێك دەبوو لە رۆمان نووسە پێشڕەوەکانی ئەم سەردەمە.**

**کامۆ، لە ساڵی ١٩٥٧دا، خەڵاتی ئەدەبی (نۆبڵ)ی وەرگرت. ئەم خەڵاتە بۆ پیاوێك کە باوکی وەرزێریی ئەم و ئەوی دەکرد و دایکی کارەکەرێکی نەخوێنەوار بوو، دەستکەوتێکی بچووك نییە.**

**سەرچاوە: داستان و نقد داستان**
جلد نخست، ضاث سوم
مؤسسة انتشارات **نگاه** – تهران- ١٣٧٥
ص ٤١٠- ٤١٥

**حەمە کەریم عارف**

* کەرکووکییە و لە ساڵی ١٩٥١دا لەدایك بووە.

- لە ساڵی ١٩٧٥ کۆلیژی ئەدەبیاتی بەغدای تەواو کردووە.
- یەکەم بەرهەمی شیعرێکە بەناوی (هەڵبەستێکی هەتیو کەوتوو) کە لە ژمارە (١٧٠) رۆژنامەی هاوکاری لە ١٩٧٣/٦/٨ بڵاوبووەتەوە.
- لە ساڵی ١٩٧٥ەوە بە بەردەوامی نووسین و بەرهەمی ئەدەبی بڵاو دەکاتەوە.
- سەرنووسەر یان بەڕێوەبەری نووسین یان سکرتێری نووسین یان ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤار و بڵاوکراوانە بووە: گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك، نووسەری کوردستان، کەلتوور،نووسەری کورد، گوڵانی عەرەبی، ئاڵای ئازادی تا ژمارە ٢٢٢، گۆڤاری نەوشەفەق.

* جگە لە ناوی خۆی، بە تایبەتی لە گۆڤاری گزنگی نووسەرانی کەرکووك،نووسەری کوردستان، کەلتوور، رۆژنامەی ئاڵای ئازادی تا ژ: ٢٢٢ بەناوی گۆڤەند، زنار، سیپان، پاکزاد، محەمەدی حاجی، سیروان عەلی، دیدار هەمەوەندی، هێژا، ح. ع ،هامون زێباری، با زەوان عەبدولکەریم بەرهەمی بڵاو کردووەتەوە.

* جگە لە پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی قوتابیانی کوردستان ئیدی ئەندامی هیچ حیزب و رێکخراوێکی سیاسی نەبووە، لە ساڵی ١٩٧٤ – ١٩٧٥دا پێشمەرگەی شۆڕشی ئەیلوول بووە، لە هەشتاکاندا بۆ ماوەی نۆ ساڵ، بێ وابەستەگی حیزبی پێشمەرگە بووە و وەکو بەشدارییەکی مەیدانی و ویژدانی لە خەباتی رەوای نەتەوەی کوردا شانازی پێوە دەکات و منەت بەسەر کەسدا ناکات، چونکە باوەڕی وایە کە رۆڵەی میللەتی مەزڵوم مەحکومە بە پێشمەرگایەتی.

- لە هەشتاکانەوە تا ئێستا راستەوخۆ سەرپەرشتی و سەرۆکایەتی لقی کەرکووکی یەکێتیی نووسەرانی کوردی کردووە.
- زۆر بەرهەم و کتێبی چاپ و بڵاو کردووەتەوە، لێ زۆربەی هەرە زۆریان، بە تایبەتی ئەوانەی لە چیادا چاپ بوون بە نوسخەی هێندە کەم بڵاوبوونەتەوە،لە نرخی نەبوو دان و هەر ئەوەندەیە کە لە فەوتان رزگار بوون. هەندێك لە وانە:

١- تیرۆژ، کۆ چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٧٩
٢- کۆچی سوور، رۆمان، چاپی یەکەم،١٩٨٨،چاپی سێیەم ٢٠٠٧
٣- بەیداخ، چیرۆك، چاپی یەکەم ١٩٨٨
٤- داوەتی کۆچەرییان، کۆ چیرۆك ،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٥- له خۆ بێگانه بوون، کۆمەڵە چیرۆک،چاپی یەکەم (١٩٩٩) دەزگای گوڵان

٦- کوچ سرخ، کۆ چیرۆک، بە فارسی، وەرگێڕان چاپی یەکەم ١٩٨٧ شاخ

٧- نینا، رۆمان، سابت رەحمان، چاپی یەکەم،شاخ،١٩٨٥ چاپی سێیەم ٢٠٠٥

٨- نامۆ، رۆمان، ئەلبیر کامۆ، چاپی یەکەم، شاخ١٩٨٧چاپی چوارەم ٢٠٠٩ وەشانخانەی سایە،سلێمانی

٩- رێبەر، رۆمان، مەهدی حسین، چاپی یەکەم (شاخ) ١٩٨٣، چاپی دووەم، ٢٠٠٧

١٠-شکست، رۆمان، ئەلکساندەر فەدایەف، چاپی شاخ (راه کارگر)، چاپی دووەم، ٢٠٠٩ خانەی وەرگێڕان.

١١- هاوماڵەکان، رۆمان، ئەحمەد مەحمود، چاپی دووەم ٢٠٠٠ دەزگای گوڵان

١٢ – بێناسنامەکان، رۆمان، عەزیز نەسین، چاپی سێیەم ٢٠٠٦

١٣- قوربانی، رۆمان، هیرب میدۆ، چاپی یەکەم ٢٠٠٤ دەزگای شەفەق

١٤- دووره ولات، رۆمان ع. ڤاسموف، چاپی یەکەم٢٠٠٠ دەزگای گوڵان

١٥- ئازادی یا مەرگ، رۆمان، کازانتزاکیس، چاپی یەکەم ٢٠٠٣ کتێبخانەی سۆران، چاپی دووەم: ٢٠٠٨

١٦- چیرۆکەکانی سەمەدی بیهرەنگی، چاپی دووەم، ٢٠٠٤ کتێبخانەی سۆران هەولێر

١٧- ئامانجی ئەدەبیات. م. گۆرکی، چاپی شاخ ١٩٨٥

١٨- ئەو رۆژەی کە ونبووم (کۆمەڵە چیرۆکی بیانی) چاپی یەکەم،٢٠٠٦

١٩- جێ پێ (کۆمەڵە چیرۆکی فارسی) چاپی یەکەم ٢٠٠٦،نووسەرانی کەرکوك

٢٠- زندە خەون، کۆمەڵە چیرۆك، چیخۆف،چ١،دەزگای موکریانی

٢١- چیرۆکستان ،کۆمەڵێك دەقورەخنەی جیهانی چ١ ،٢٠٠٥،نووسەرانی کەرکوك

٢٢-دیدارو دەق و رەخنە،چ١،٢٠٠٥

٢٣-دیداری چیرۆکڤانی، چ١،٢٠٠٥

٢٤-ئەو بەرخەی کە بوو بە گورگ ،چ١،٢٠٠٨نووسەرانی کەرکوك

٢٥- میوان، چیرۆك،ئەلبێر کامۆ

---

٢٦- مەسەلەی کورد لە عێراقدا،عەزیز شەریف،چاپی دووەم ٢٠٠٥

٢٧- مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد، ئیحسان نوری پاشا،چ١،٩٩٨

٢٨- كورد گەلی لە خشتەبراوی غەدر لێکراو، د. کوینتەر دیشنەر، چاپی سێیەم ٢٠٠٤
٢٩- لە مەهابادی خوێناوییەوە بۆ کەنارێن ئاراس، نەجەف قولی پسییان، چاپی یەکەم ٢٠٠٦
٣٠- کورد لە سەدەی نۆزدەوبیستەمدا،کریس کۆچرا،چاپی چوارەم ٢٠٠٧
٣١ –کورد لە ئینسکلۆپیدیای ئیسلامدا،چاپی یەکەم ١٩٩٨
٣٢- چینی کۆن، چ١(        )دەزگای موکریانی

٣٣- دلێریی خۆراگرتن، ئەشرەفی دەهقانی
٣٤- خەباتی چەکداری هەم تاکتیکە هەم ستراتیژ، مەسعودی ئەحمەد زادە

٣٥- ڤنسنت ڤان گوگ، شانۆنامە، باول ئایز لەر
٣٦- بە دوعا شاعیرەکان، شانۆنامە، جەلیل قەیسی (گزنگ ژ:١٢)
٣٧- جولەکەکەی مالْتا، شانۆنامە،کریستۆفەر مالرۆ.
٣٨- دادپەروەران، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ
٣٩- بەد حاڵی بوون، شانۆنامە، ئەلبیر کامۆ.
٤٠- چاو بە چاو، شانۆنامە، گەوهەر مراد (غولام حسەینی ساعیدی)
٤١- ریچاردی سێیەم، شانۆنامە، شەکسپیر.چاپی یەکەم ٢٠٠٩، بڵاوەخانەی سایە، سلێمانی
٤٢- گەمەی پاشا و وەزیر، شانۆنامە، عەبدوڵلائەلبوسێری..

٤٣- مندالە دارینە، چیرۆکی درێژ بۆ مندالان.
٤٤- فاشیزم چییە؟ کۆمەڵە چیرۆك بۆ مندالان، یەلماز گونای
٤٥- شوانە بچکۆلەکە، چیرۆکێکی درێژی چینی یە بۆ مندالان
٤٦- زارۆکستان (چوار شانۆنامە بۆ منالان)
٤٧- چەند چیرۆکێك لە ئەفسانەی یونانی کۆنەوە (٢٣ئەفسانە)

٤٨- لە گەنجینەی حیکایەتی تورکمانییەوە. (ئەفسانەی ئەسپی ئاشق)چاپی یەکەم٢٠٠٨
٤٩- ئەفسانەێن گریکی و رۆمانی، چاپی یەکەم (٢٠٠٤) کتێبخانەی سۆران، هەولێر
٥٠- ئیلیادە، هۆمیرۆس، چ١،دەزگای سەردەم ٢٠٠٩

٥١- گۆڤەند و زنار (فەرهەنگی فارسی - کوردی) حەمە کەریم عارف، چ١(٢٠٠٦-٢٠٠٨)دەزگای موکریانی
٥٢-چۆنیەتی فێربوونی زمانی فارسی، چ١، ٢٠٠١

---

٥٣- چرنیشفسکی، فەیلەسوف و زانای گەورەی میللەتی روس
٥٤- چایکۆ فسکی، ژیان و بەرهەمی.
٥٥- ئیدگار ئالین پۆ، ژیان و بەرهەمی.
٥٦- جاك لەندەن، ژیان و بەرهەمی
٥٧- گوگول، نووسەری ریالیست
٥٨- یەڵماز گونای، ژیان و بەرهەمی
٥٩- سادقی هیدایەت، ژیان و بەرهەمی
٦٠- خافروغ لە شیعر دەدویٚ، ژیان و بەرهەمی

---

٦١- راگەیاندن لە پەراوێزی دەسەڵاتدا (بە شەریکی) چاپی یەکەم (٢٠٠١) دەزگای گولان
٦٢-راگەیاندن لە نێوان حەقیقەت بێژی و عەوام خەڵەتێنی دا، حەمە کەریم عارف،چ(١)،٢٠٠٥

---

٦٣- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە کۆنەوە تا سەدەکانی ناڤین).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٤- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (لە سەردەمی رینیسانسەوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٥- مێژووی ئەدەبیاتی جیهان (ئەدەبیاتی ئینگلیزی زمان- ئەمریکاو ئینگلیستان لە سەرەتاوە تا ئێستا).چاپی یەکەم٢٠٠٨
٦٦- ریالیزمودژە ریالیزم لە ئەدەبیاتدا،سیروس پرهام،چ١،٢٠٠٤،دەزگای سپیرێز
٦٧- قوتابخانە ئەدەبییەکان،رەزا سەید حسەینی، چ١،٢٠٠٦دەزگای موکریانی
٦٨- مێژووی ئەدەبیاتی روسی، سەعیدی نەفیسی
٦٩- لێکدانەوەیەك لەمەڕ نامۆ ، لویس ریی ،چ٢، ٢٠٠٦
٧٠- هونەروژیانی کۆمەڵایەتی، بلیخانۆف، چ١(٢٠٠٥)دەزگای موکریانی
٧١- گوزارشتی مۆسیقا،د. فواد زکریا، چ١،یانەی قەڵەم ٢٠٠٦
٧٢- رێبازە هونەرییەکانی جیهان
٧٣- پێکهاتەی بەدەنی و چارەنووسی ئافرەت،(چ١) ٢٠٠٦

٧٤- دەربارەی شیعروشاعیری، حەمە کەریم عارف، چ١،٢٠٠٧

٧٥- دەربارەی رۆمان و چیرۆك، حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٨

٧٦- مەرگی نووسەرو چەند باسێکی دیکەی ئەدبی-رۆشنبیری،حەمەکەریم عارف،چ١، ٢٠٠٥نووسەرانی کەرکوك

٧٧- ناودارانی ئەدەب، حەمە کەریم عارف، (چ١) دەزگای موکریانی،٢٠٠٩

٧٨- پەیڤستانی من، حەمە کەریم عارف،چاپی یەکەم()

٧٩- پەڵکە رەنگینە، حەمە کەریم عارف،چ١، ٢٠٠٤

٨٠- خیانەتی حەڵاڵ، حەمە کەریم عارف

* لە راپەڕینەوە تا نەوو چالاکانە بەشداری بزاڤی ئەدەبی و رۆشنبیریی کوردی دەکات وبەرهەمی هەمە جۆر (نووسین و ئامادە کردن و وەرگێڕان) بڵاودەکاتەوە..

* ئەو بەرهەمانە و زۆری دیکەی ئامادەن بۆ چاپ و چاپکردنەوە و هەر کەس و گروپ و لایەن و دەزگایەك تەماحی بڵاو کردنەوەی هەبن، دەبێ پرس بە نووسەر بکات...